# ڕۆڤار

ژمارە ٧٨

ڕۆڤار، بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە
هەر ژمارەی
تایبەتە بەداهێنەرێکی کورد
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
دوو مانگ جارێک دەریدەکات

سەرپەرشتیار
ڕەووف بێگەرد

بەڕێوەبەری نووسین
کامەران سوبحان

دەرهێنەری هونەری
ئومێد محەمەد

دیزاینی بەرگ
ئارام عەلی

تایپیست
ئارام مەحموود

ناونیشان
سلێمانی- شاڕێی سالم
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

www.serdem.net

پەیوەندیکردن بەڕۆڤارەوە لەڕێگەی ئیمێڵی
Rovar.sardam@gmail.com
Rovar.facebook.com

چاپخانەی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

نرخ: 1000دینار

بەرگ و پۆستەر: ئاکۆ غەریب
مۆتیڤی ئەم ژمارەیە: نەرمین مستەفا

بەسوپاسەوە ئەم ژمارەیە (جەمال لۆلۆ) هاوکارمان بووە

## ژمارەکانی ڕابردووی ڕۆڤار

ئیبراهیم ئەحمەد، محەمەد مەولود (مەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارەی ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هەردی، یەڵماز گۆنای، ئیسماعیل بێشکچی، موحەرەم موحەمەد ئەمین، دڵدار، مەستورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، جەلالی میرزا کەریم، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری، جەلال تەقی، حەمە ساڵح دیلان، هەژار، شاکیر فەتاح، کاکەی فەلاح، عەلائەدین سەجادی، شێخ محەمەدی خاڵ، حسێن عارف، عەلی ئەشرەفی دەروێشیان، سەلیم بەرەکات، پێشەوا قازی محەمەد، مەحموود مەلا عیزەت، فایەق بێکەس، عەبدوڵڵا پەشێو، جگەرخوێن، بابەتاهیری عوریان، عەرەب شەمۆ، دڵشاد مەریوانی، مەنسوری یاقوتی، حەسەنی قزڵجی، برایم ئەمین باڵدار، مەسعود محەمەد، بەختیار زێوەر، نەجمەدینی مەلا، مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی، لەتیف هەڵمەت، حاجی قادری کۆیی، پیرەمێردی نەمر، مەلا مەحموودی بایەزیدی، شێخ ڕەزای تاڵەبانی، شەریف پاشای خەندان، جەمیل صائیب، ئەحمەد موختار جاف، عەبدولڕەحیم ڕەحیمی هەکاری، میر شەرەف خانی بەدلیسی، وەفایی، گۆران، بەدیع باباجان، جەمال شارباژێڕی، مارف بەرزنجی، نالی، مەحوی، ئەنوەر قەرەداخی، حەمەی مەلا کەریم، سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی، ئیبراهیم یونسی، قەرەنی جەمیل، مەلای گەورەی کۆیە، تۆفیق وەهبی بەگ، محەمەدئەمین زەکی، عەبدوڵڵا جەوهەر، شێرکۆ بێکەس، سالم.



### ژمارەی داهاتومان بۆ (ئەحمەد کایا) دەبێت

خوێنەرانی ڕۆڤار ئاگادار دەکەینەوە، ژمارەی داهاتووی ڕۆڤار بۆ هونەرمەندی ناوداری کورد (ئەحمەد کایا) دەبێت، بەو بۆنەیەوە داوا لە نووسەران و هونەرمەندان دەکەین، بە نووسین و بابەتی پەیوەندار بەو هونەرمەندە هاوکاری ڕۆڤار بکەن..
چاوەڕێی بابەتەکانتانین، لەڕێگەی ئیمێڵ و ناونیشانی ڕۆڤار لە تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبوک.

# پێڕست


| | | |
|---|---|---|
| سەروتار... | ڕۆڤار | ٤ |
| عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ کێیە؟ | جەمال لۆلۆ | ٦ |
| بیبلیۆگرافیای *(د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ)* لە ناوەڕۆکی کتێبی کوردیدا | بوار نورەدین | ١٤ |
| ئەزموونی نووسینم | د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ | ٢٠ |
| چەند وشەیەکی شەرمن، بۆ مرۆڤێکی بەخشندە...! | جەمال عەبدول | ٢٢ |
| ئێمەش منداڵ بووین.. | د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ | ٢٤ |
| مێژووی ئەدەبی کوردییەکەی *(د. عیزەدین)* | کاروان عوسمان خەیات *(ڕێبین)* | ٣٠ |
| بەشێك لە یادەوەرییەکانم لەبارەی دکتۆر عیزەدین مستەفاوە | محەممەدی مەلا کەریم | ٤١ |
| عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ ئینسکلۆپیدیای ئەدەبی کوردی | د. هەڤاڵ ئەبوبەکر | ٤٤ |
| د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، پیاوێك لە کتێب | د. ڕەئوف عوسمان | ٤٦ |
| د.عیزەدین پیاوێکە لە یاقووت | مستەفا ساڵح کەریم | ٥٢ |
| دوو کاتژمێر لەگەڵ پرۆفیسۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ | ڕۆڤار | ٥٤ |
| دکتۆر عیزەدین... ئەستێرەیەکی گەشی زمانی کوردی | شێرکۆ بێکەس | ٦٠ |
| فاروقی مەلا مستەفا: دکتۆر عیزەدین بەمانای وشە ڕۆشنبیرە | ڕۆڤار | ٦١ |
| د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ لە چەند وێستگەیەکدا | سالار عوسمان | ٦٦ |
| من و پرۆفیسۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ | د. جەمشید حەیدەری | ٩٦ |
| د. عیزەدین زانایەکی فرە بەهرە | د. کەمال غەمبار | ٧٢ |
| لەبارەی یاداشتەکانی دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵەوە | ڕێبوار جەواد | ٧٦ |
| هەست و سۆزی وەفاداری بۆ ...... | یاسین قادر بەرزنجی | ٧٩ |
| دونیایەك لەباوکایەتی | د. یار عیزەدین مستەفا | ٨٢ |
| بۆ باوکی ئازیزم... | ڕاز عێزەدین مستەفا | ٨٣ |
| ئەلبوومی وێنەکان | | ٨٥ |

# دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ ..وەك خۆی

*ڕۆڤاری ئەم ژمارەیەمان بۆ یەکێک لەنووسەر وکەسایەتییە ئەکادیمییەکانی ناوەندی ڕوناکبیریی کورد تەرخان کردووە.ئەویش پرۆفیسۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵە، دەرکردنی ڕۆڤارێک بۆ ئەم کەسایەتییە هەوڵێکە بە ئاڕاستەی بەسەرکردنەوەو خوێندنەوەی ئەو پاشخانە ئەکادیمی و فەرهەنگییەی کە ئەم پرۆفیسۆرە زیاتر لە نیو سەدەیە سەرقاڵە پێوەی و کاری بۆ دەکات و بەردەوامیش لەکارکردندا ماندووبون ناناسێت و هەمیشە وەک سۆفییەکی پڕ لە وزە سەری لەسەر کتێب و پەڕە و وشەیە.

*د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، یەکێکە لە دامەزرێنەرانی یەکێتی نووسەرانی کورد و کۆڕی زانیاری و دامەزرێنەری چەندین گۆڤار و ناوەندی ئەکادیمی بووە، ئەمە جگە لەوەی خاوەنی زیاتر لە ٨٠ کتێبی چاپکراوە، لەبواری ئەکادیمیشدا سەرپەرشتی کۆمەڵێکی زۆر نامە و تێزی ماستەر و دکتۆرای لە زانکۆکانی کوردستان کردووە، وەک خۆی لە چاوپێکەوتنەکەی ئەم ژمارەیەی (ڕۆڤار)دا ئاماژەی بۆ دەکات هەرگیز لە سیاسەت دانەبڕاوەو خۆی بە ئەندامی حیزبی شیوعی دەزانێت لە ساڵی ١٩٤٦ ەوە تا ئێستا، بۆیە لە ڕۆڤارەکەدا ئەم تایبەتمەندییانە لەبەرچاو گیراوەو هەوڵدراوە بەشێک لەهاوڕێ و قوتابی و دۆستەکانی قسە لەسەر کتێب و ژیان و ڕۆڵ و قورسایی ئەو لە ناوەندی ڕوناکبیریدا بکەن، ئەمە جگە لە چاوپێکەوتنەکەی خۆی کە تیشک دەخاتە سەر زۆر لایەنی شاراوەی بواری سیاسی و ڕوناکبیریی خۆی.

* دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، مرۆڤێکی پڕ بەرهەم و پڕ چالاکییە، لە زۆر بواریشدا بەرهەمی هەیە، خاوەنی کتێبخانەیەکی گەورەو کتێبی دانسقەیە، شیعر و چیرۆک و لێکۆڵینەوەی هەیە، دەستنووسی ساغکردوەتەوەو خۆی لەقەرەی فۆلکلۆر داوە، خۆی لە چاوپێکەوتنەکەی ئەم ژمارەیەی (ڕۆڤار)دا ئاماژەی بۆ دەکات شیعرەکانی لەئاستی شیعرە گەورە و بەرزەکانی شیعری کوردیدا نین، بەڵام شیعرەکانی وەک خۆی دەڵێت :دەخوێنرێنەوەو هەندێ کەسیش لەبەری کردوون.

*پەیوەندییەکانی د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، بەرفراوان و هەمەجۆرن، بەشێکی زۆری کەسایەتییە سیاسیە گەورەکانی هەر چوار پارچەی کوردستان هاوڕێ و دۆستی ئەمن و وێنە و ئەرشیف و یادەوەری لەگەڵیاندا هەیە ، زۆر جاریش لە دانیشتنەکاندا یاداشت و بەسەرهاتی گرنگ و نەبیستراو لەسەر سەرکردە کوردەکان باس دەکات، لە باسی سەرکردەکانی کورددا دکتۆر عیزەدین پێی وایە قازی موحەمەد خوێندەوارترین سەرکردەی کوردە کە زۆرترین زمانی بیانی دەزانێت. هەر بۆیە لەم ژمارەیەدا بایەخێکی زۆرمان داوە بەو وێنە مێژووییانەی ئەو لەگەڵ سەرکردە و کەسایەتییە سیاسییەکانی کوردو کۆمەڵێکمان بڵاوکردووەتەوە.

ڕۆڤار

# عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ کێیە؟

جەمال لۆلۆ



## پێشینەیەکی بنەماڵەیی و منداڵی:

عیزەدین کوڕی مەلا مستەفای سەفوەت کوڕی حاجی مەلا ڕەسووڵی دێلێژەیە، ساڵی ١٩٣٤ لە گەڕەکی (دەرگەزێن) ی شاری سلێمانی لەدایک بووە، سێیەم منداڵی باوک و چوارەم منداڵی دایکیەتی. کاتێک دایکی لە مێردی یەکەم جیا بووەتەوە، لەگەڵ مەلا مستەفای سەفوەتدا خێزانی پێک هێناوەتەوە. عیزەدین لەناو بنەماڵەیەکی مەلازادە و خوێندەواردا ژیاوە؛ باپیری-واتا حاجی مەلا ڕەسووڵ- یەکێک بووە لە زانا ئاینیەکانی سەردەمی حکومەتی خوارووی کوردستان و لەلایەن مەلیک و کاربەدەستانەوە گوێی لێ گیراوە. حاجی مەلا ڕەسووڵ (٥) کوڕی هەبووە، کوڕەکانی سەرجەمیان خوێندەوار و مامۆستای ئاینی بوون؛ «مەلا مستەفا» کە باوکی دکتور عیزەدینە، مەلا مەحمود کە باوکی شەهید فازیلی مەلا مەحمود و فوئادە و مەلا نەجمەدین شاعیر و پیاوێکی نوێخواز بووە. مەلا مستەفای سەفوەت بە کاری مەلایەتییەوە لە شاری سلێمانی ژیانی گوزەراندووە، لەبەر ئەوە لە ڕووی گوزەرانەوە زۆرباش نەبوە، واتا ژیانێکی مام ناوەندی بەڕێ کردووە، بەردەوام خەریکی خوێندنەوە و بەتایبەت «تەسەوف» بووە.

کاتێک عیزەدین لەدایک دەبێ، مەلا مستەفا بە ناوی «عز بن عبدالسلام» یا «عیزەدین»ەوە، لە خۆشەویستیی ئەو سۆفییە مەزنە، ناوی ناوە. حاجی مەلا ڕەسووڵ هەر بە منداڵی هاتووەتە سلێمانی، هەر لەو شارە درێژەی بە خوێندن داوە، بەڵم چ حاجی مەلا ڕەسووڵ چ نەوەکانی پێوەندییان لەگەڵ گوندی «دێلێژە» نەبڕیوە.

عیزەدین مستەفا سێ خوشک و برایەکی هەیە کە بە ناوی باوکیەوە فارووقی مەلا مستەفا ناسراوە.



(وێنەیەکی خێزانی)

**دانیشتوەکان: د. عیزەدین مستەفا لانە لەباوەشیدایە، ڕووناك خانی خێزانی ئاران لەباوەشیدا**

**وەستاوەکان لەڕاستەوە: د. یار عیزەدین، د. ڕێباز جەمال عەبدول، بادە عیزەدین، شوان ئەحمەد زرنگ، ڕاز عیزەدین**

## خوێندن:

عیزەدین لە لای باوکی لە مزگەوتی خۆیان -واتا مزگەوتی «حاجی مەلا ڕەسووڵی دێلێژە»- خوێندویەتی، پاشان ساڵی ١٩٣٩ وەک گوێگر لە قوتابخانەی «غازی» وەرگیراوە، پاش نیوەی ساڵ بەڕێوەبەری خوێندنگەکە دیویەتی منداڵێکی وریا و زیرەکە، پێی وتووە: برۆ ٢ وێنە بگرە و بۆم بێنە، کردوویە بە خوێندکار و سەری ساڵیش بە یەکەم دەر چووە. بەڵام پێش ئەوەیش جاران حوجرە هەبوە، عیزەدین دوای دەوامی خوێندن لە حوجرەی مزگەوتی خۆیاندا خوێندوویە لەلای «مەلا حامید» کە حامید زەکیی پێ وتراوە -کوڕی مەلا حەمدونی شاعیر- و لە مزگەوتەکەی ئەماندا ژوورێکی وەر گرتووە و دەرسی تێدا بە خوێندکاران وتووەتەوە. عیزەدینش لەلای ئەم درێژەی بە فێربوون داوە. کاتێ چوویشە بۆ قوتابخانە، پێشتر «ئەلفوبێ« و «جزم عەم»ی خوێندووە، بەڵام حوجرەی تەواو نەکردووە.

لەبەر ئەوەی باوکی مەلای مزگەوت بووە، فەقێی هەبوە دەرسی پێ وتوونەتەوە. هەموو ڕۆژەکان عیزەدین چووەتە لای باوکی، کە وانەی بە فەقێکان وتـووە و ئێوارانیش لەسەر سەکۆی ناو مزگەوتەکە لەگەڵ خوێندەوار و ناسراوەکانی خۆیدا کۆ بووەتەوە؛ ئەمانە هەموویان کاریگەریی زۆریان لەسەر بیرکردنەوە و پێگەیشتنی عیزەدین داناوە. لەلایەکی ترەوە، لە ژیانی منداڵیدا زۆرکەم تێکەڵ بە هاوتەمەنەکانی خۆی بووە. دواتر لە مەکتەبی فەیسەڵییە درێژەی بە خوێندن داوە. دوای تەواوکردنی خوێندنی سەرەتایی، چووەتە ناوەندی و لە سێی ناوەندی تاقیکردنەوەی بەکالۆریی ئەنجام داوە و سەرکەوتوو بووە. باوکی (مەلا مستەفای سەفوەت) پێی وتووە: بۆ درێژەدان بە خوێندن بچۆ بۆ بەغدا و لە کۆلێژی شەریعە بخوێنە، هەم خوێندنێکی ئەکادیمیە، هەم مەلایەتییەکەشت دەمێنێتەوە.





لەقوتابخانەی قەڵادزێ ساڵی ١٩٥٤ کاتێ مامۆستابووە

دوای چوونی بۆ بەغدا، بووەتە خوێندکاری کۆلێژی شەریعە، بەڵام بەهۆی تێکەڵبوونی بە کاری سیاسییەوە هەر لە ناوەندییەوە، ساڵی یەکەمی شەریعەی پێتەواو نەکراوە و دەر کراوە. گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی و ساڵی دواتر چووەتە پۆلی چوارەمی بەشی زانستیی تەواو کردووە. لەو دەمەدا بەشی ئەدەبی لە شاری سلێمانی نەبوە، ساڵی دواتر کراوەتەوە. یەکێک لە مامۆستاکانی بە ناوی «مووسا سەمەد»ەوە داوای لێ کردووە بچێتە بەشی ئەدەبی لە پۆلی پێنجەم لە خوێندنی شەوانە. پاش تەواوکردنی پۆلی پێنجەم، چووەتە بەغدا بۆ تەواوکردنی خوێندنی خانەی ماڵی مامۆستایان.

ساڵی ١٩٥١ لە خانەی ماڵی مامۆستایان وەرگیراوە. ساڵی ١٩٥٢ بەشداری ڕاپەڕینی ئەو ساڵە بووە لە شاری بەغدا، بریندار بووە. دواتر لە کۆلێژ دەر کراوە لەبەر بەشداریی ڕاپەڕینەکە. گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی و لە دائیرەی مەلاریا بە ناونیشانی کرێکار دامەزرێندراوە. دواتر لە ڕێی چەند کەسێکەوە باوکی کردوویەتی بە مامۆستای سەرەتایی لە قەڵادزێ. لەوێش بە هۆی کاری سیاسییەوە گواستراوەتەوە بۆ سلێمانی، دواتر بۆ قەمچووغە. لەوێش بە کاری سیاسییەوە خەریک بووە، دووبارە گێڕاویانەتەوە بۆ سلێمانی. عومەر عەلیی موتەسەڕیفی سلێمانی کابرایەکی تورکی دڵڕەق و توند بووە، خەڵکی بانگ کردووە (بەرائەتنامە) ئیمزا بکەن. لەبەر ئەوە عیزەدین خەریکی کاری سیاسی بووە، ئەویشی بانگ کردووە. پێی وتووە حەفتەیەکی تر وەرەوە بۆ ئیمزاکردن. عیزەدین لەو هەفتەیەدا هەڵهاتووە بۆ شام و عیراقی جێ هێشتووە. دووبارە لە کۆلێژی ئاداب لە شام درێژەی بە خوێندن داوە و پۆلی ٢-٣ی بەشی عەرەبیی ئادابی تەواو کردووە، هەتا شۆڕشی ١٤ تەمووزی ١٩٥٨ گەڕاوەتەوە بۆ بەغدا و لە قۆناغی سێهەمی خانەی مامۆستایان دانراوە. پاشان تەواوی کردووە و هەر لە بەغدا لە بەڕێوەبەرایەتیی خوێندنی کوردی —کە یەکەم ساڵ بووە پێک هێنراوە- دامەزرێنراوە.

عەبدولکەریم قاسم کەوتە ناردنی خوێندکار بۆ سۆڤیەت لەسەر ئەرکی دەوڵەت. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵیش زەمالەی خوێندنی بۆ دەرچووە چووەتە سۆڤیەت. دوای تەواوکردنی زمان، لەگەڵ کەمال مەزهەر و نەسرین فەخریدا چووەتە باکۆ، ١٩٦٣/٦/٢٤ پلەی دکتورای وەر گرتووە. پاشان بە داوای حیزبی شیوعیی عێراق چووەتە (سۆفیا)ی پایتەختی بولگاریا بۆ سەرپەرشتیی ڕادیۆی نهێنیی (دەنگی گەلی عێراق). حیزبی توودەی ئێرانیش ڕادیۆیەکی هەبووە بە ناوی (پەیکی ئێران)ەوە بە زمانی فارسی و ئازەری و کوردی. دواتر بەشی کوردی لەسەر دەستی عیزەدین مستەفا کراوەتەوە. لە ڕادیۆی دەنگی گەلی عێراقیش کە هەر د. عیزەدین خۆی بابەتەکانی لە عەرەبییەوە وەر گێڕاوە یان نووسیوە، هەر خۆی خوێندوویەتیەوە. پاشان گەڕاوەتەوە بۆ مۆسکۆ. دواتر ساڵی ١٩٦٥ گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان و چووەتە شاخ و بووە بە پێشمەرگەی حیزبی شیوعیی عێراق. دوای ساڵێک مانەوە لە بارەگای بارزانی، ١٩٦٦/١٢/٢٦ بە هەوڵێکی مەلا مستەفای بارزانی بووەتە مامۆستا لە زانکۆی بەغدا و لە بەشی کوردی دامەزرێنراوە.

ساڵی ١٩٧٩ چووەتەوە بۆ مۆسکۆ، درێژە بە خوێندن داوە و پلەی دکتۆرای «ناووک» و پرۆفیسۆری وەر گرتووە.

د. عیزەدین مستەفا رەسوڵ، دیلێژە- ١٩٤٨



## کاری سیاسی:

عیزەدین مستەفا هەر لە مێردمنداڵییەوە تێکەڵ بە کاری سیاسی بووە، زۆر جار هۆی دواکەوتنی لە خوێندن هەر ئەمەبووە. سەرەتای چوونە کۆلێژی لەسەر کاری سیاسی دەرکراوە،دواتر کە گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی، گواستنەوەی لە سلێمانییەوە بۆ قەڵادزێ و دوواتر بۆ سلێمانی و قەمچووغە، هەر هۆکارەکەی سیاسی بووە. عیزەدین سەرەتای ساڵی ١٩٤٧ — پێوەندیی بە ریزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە هەبوە، بەڵام ساڵی ١٩٤٩ وازی لێ هێناوە و پێوەندیی کردووە بە ریزەکانی حیزبی شیوعیی عیراقەوە. پاشان ماوەیەک جیا بووەتەوە، دواتر ساڵی ١٩٥٥ لە ڕێی سکرتێری لقی کوردستانی حیزبی شیوعی کاکەی فەلاح گەڕاوەتەوە ریزەکانی حیزب.

عیزەدین یەکێکە لە کادیرە زۆر چالاک و وریاکانی حیزب، بێ دابڕان هەتا ئێستاش هەر پێوەندی نەپساوە و لە ریزەکانی ئەو حیزبەدا ئەندامە. ساڵی ١٩٩٢ بووە ئەندام لە یەکەم پەرلەمانی باشووری کوردستان لەسەر لیستی (ی. ن. ک)، بەڵام وەک کەسێکی بێلایەن.

لە خۆپیشاندانەکانی ساڵی ١٩٥٢دا -بەتایبەت ڕاپەڕینی تشرین- بەشداریی کردووە وەک خۆپیشاندەر و وتاری پێشکەش کردووە. لەم ڕاپەڕینەدا کە لەگەڵ « کەمال فوئاد»ی یەکێک لە هاورێ نزیکەکانیدا بووە، بریندار کراوە و قاچی پێکراوە، عیزەدین بە برینداریش کۆڵی نەداوە، بەڵام لەژێر فشاری کەمال فوئاددا براوە بۆ نەخۆشخانە. دوای ئەمە خوێندنی بەجێ هێشتووە و گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی، ماوەی ٤ مانگ خۆی شاردووەتەوە. کاتێ قوتابخانە دانراوەتەوە، پێیان وتووە: هیچت لەسەر نییە وەرەوە بۆ خوێندنەکەت. کە چووەتەوە بۆ قوتابخانە، گیراوە و حوکم دراوە بە ساڵێک زیندان یا ٣٠٠ دیناری ئەودەم. دوای مانەوەی ٦ مانگ لە زیندان، باوکی ٣٠٠ دینارەکەی پەیدا کردووە و ئازاد بووە. بەڵام ژمارەیەکی زۆر لە خوێندکارەکان لە کۆلێژ دەر کرابوون، عیزەدین یەکەم ناو بووە. هەموو ئەم دەردەسەرییە بۆ خۆی و خێزانەکەی کۆڵی پێ نەداوە تا واز لە کاری سیاسی بهێنێ، بۆیە ئەم جارەیان لەژێر فشاری عومەر عەلیدا لە شاری سلێمانی عیزەدین عیراقی بەجێ هێشتووە و ڕووی کردووەتە شام. لەوێش بە کاری سیاسی و خوێندنەوە خەریک بووە، تا شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ کە گەڕاوەتەوە بۆ عیراق. دوای تەواوکردنی خوێندن، ساڵی ١٩٦١ ڕووی لە وڵاتی سۆڤیەت کردووە بە نیازی خوێندن، بەڵام بێدابڕان لە کاری سیاسی.



عیزەدین بە دەستی بەعسیش زۆری چێشتووە، لە یەکێک لە گێڕانەوەکانیدا باسی کردووە: ساڵی ١٩٧٨ من و «حەمەی مەلا کەریم»یان برد بۆ ئەمنی شیمال لە هەولێر و تا بەیانی بە پێوە ڕایان گرتین. وتیان: ئێوە زەرەر دەکەن ئەم دوو کەسەتان خۆتان کردووە بە جێگری بزووتنەوەی کورد بە هەموو باڵەکانیەوە، خۆتان کردووە بە جێگری حیزبی شیوعی بە هەموو باڵەکانیەوە. جوابم دایەوە وتم: زەرەری چیمان کردووە، دەتوانن بمانگرن، بمانکوژن، بەڵام ناتوانن پێمان بڵێن پیاوخراپن و دوژمنی گەلەکەیان بوون. دوای ڕاپەڕینی

ساڵی ١٩٩١ عیزەدین هەر لەسەر کاری سیاسیی خۆی بەردەوام بووە و ماڵەکەی بووەتە جێکۆبوونەوەی بەرەی کوردستانی، دواتریش ڕۆڵی گرنگی گێڕاوە لە ئاشتکردنەوەی لایەنە ناکۆکەکاندا و زۆر دژی شەڕی براکوژی بووە. کاتێکیش ئەندامی پەرلەمان بووە، لەناو پەرلەماندا لەگەڵ هاوڕێکانیدا هەڵوێستی توندی نواندووە و پەناگر بوون..

## یەکێتیی نووسەرانی کورد:

عیزەدین مستەفا یەکێکە لە دامەزرێنەکانی یەکێتیی نوسەرانی کورد، یەکەم بەیاننامەی دامەزراندنی بە قەڵەمی عیزەدین نوسراوە. دەستەی دامەزرێن ١١ کەس بوون. ساڵی ١٩٦٩ ئیجازەیان وەر گرتووە و جەمال بابان کراوە بە سەرۆکی دەستەی دامەزرێن. بەڵام دوای گەڕانەوەی نووسەرانی شاخ پاش بەیاننامەی ١١ی ئازار، ئەم دەستەیە هەڵوەشێندراوەتەوە و (لە هۆڵی خولد) لە بەغدا هەڵبژاردن کراوە، د. عیزەدین بە کۆی ٦٣ دەنگ بووەتە سەرۆکی یەکێتیی نووسەرانی کورد.

ساڵی ١٩٧٤دا لە هەولێر کۆنگرە گیراوە، لەم کۆنگرەیەدا سەیدا ساڵح یوسفی بووەتە سەرۆک و د. عیزەدین جێگر. ساڵانی دواتریش درێژەی بە کاری ڕۆشنبیریی خۆی داوە لەناو ئەم ڕێکخراوەیەدا. دوای ساڵی ١٩٩١ی ڕاپەڕینەکە ئەم ڕۆڵە تۆختر بووەتەوە و ئازادانەتر کاری کردووە.

د. عیزەدین ڕۆڵێکی گرنگی لە یەکێتیی نووسەراندا گێڕاوە، چ لە چارەسەرکردنی کێشەکاندا و چ لە چالاکیەکاندا، بەتایبەت دەرکردنی گۆڤاری (یەکێتیی نوسەران).




د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، لە کتێبخانەکەیدا

**قۆناغی نووسین:**

ئەم قۆناغە وەرچەرخانێکی گرنگە لە ژیانی د. عیزەدین، چونکە ئەم قۆناغەیە بووەتە هەوێنی لەدایکبوونی «٨٦» بەرهەمی ناوازە. سەرەتای نووسینی لە ڕۆژنامەی دیوارەوە دەست پێ کردووە، کاتێ خوێندکار بووە لە پۆلی پێنجەمی سەرەتایی لە مەکتەبی فەیسەڵییە بە چاودێریی مامۆستایان محەمەد تۆفیق عەزیز و فازڵ عیرفان دەستی بە نووسینی ڕۆژنامەی دیوار کردووە. دوای ئەمە کەوتووەتە نووسینی هەندێک بابەتی سیاسیی ڕۆژانە. دواتر کە لە خانەی بەرزی مامۆستایان وەرگیراوە، یەکسەر بووەتە ڕۆژنامەنوس لە ڕۆژنامەی «ئەهالی» کە «کامیل چادرچی» خاوەنی بووە. کە ڕۆژنامەی ئەهالی داخراوە، گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی. پێش ئەوەی ببێ بە مامۆستا، مامۆستا گۆران لە ڕۆژنامەی «ژین» بووە، چووەتە لای و ڕۆژانە بابەتی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی لەو چەند گۆڤار و ڕۆژنامە لوبنانیانەوە کە دەگەیشتە دەستیان. لە باری نووسینەوە، بەتایبەت پەخشان و هونەری شیعر، مامۆستا گۆران کوردیەکەی بۆ ڕاست کردووەتەوە. پاشان بە ناوی (ع. م) و (ع. مستەفا) و هاوار مستەفا هەندێ بابەتی لە فارسییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و لە «ژین»دا بڵاو کراوەتەوە. دوای مامۆستا گۆران، ئەحمەد زرنگ بووە بە سەرنووسەر، هەرچی سەروتار هەیە ئەم بە ناوی «ز» واتا «زرنگ»ەوە نووسیویە. بەم شێوەیە سەرەتای نووسینی د. عیزەدین دەستی پێ کردووە. بە سەدان وتار و پەخشان و بەرهەمی ناوازەی بە زمانەکانی کوردی، عەرەبی، ڕووسی لەدایک بوون. چونکە د. عیزەدین شارەزاییەکی باشی لە زمانەکانی (کوردی بە دیالێکتەکانیەوە)، عەرەبی، فارسی و ڕووسیدا هەبوە.



**پرۆفایل:**

- ٢٦ شوباتی ١٩٣٥ لە سلێمانی لەدایک بووە.
- ساڵی ١٩٤٩ بووەتە ئەندامی حیزبی شیوعیی عیراق.
- ساڵی ١٩٥٩ خانەی بەرزی مامۆستایانی لە بەغداد تەواو کردووە.
- ساڵی ١٩٦٣ یەکەم گەواهینامەی دکتۆرای لە باکۆ وەر گرتووە.
- ساڵی ١٩٦٦ بووەتە مامۆستا لە بەشی کوردیی کۆلێژی زمان لە زانکۆی بەغدا.
- ساڵی ١٩٦٩ لەگەڵ چەند نووسەرێکدا یەکێتیی نووسەرانیان دامەزراندووە.
- ساڵی ١٩٦٧ ژیانی خێزانیی پێکهێناوە لەگەڵ مامۆستا ڕووناک عەلی ساڵح ڕەشەدا، بەرهەمی ئەم ژیانە سێ منداڵە بە ناوەکانی:

راز: دەرچووی بەشی کارەبای کۆلێژی ئەندازەیە.

یار: کۆلێژی پزیشکی بەشی چاوی تەواو کردووە، ئێستا دکتۆرای لەم بوارەدا هەیە.

بادە: لیسانسی ئابووریی تەواو کردووە.

- ساڵی ١٩٧٩ دکتۆرای دووەمی وەر گرتووە لە مۆسکۆ «دکتۆرای ناووک».
- ساڵی ١٩٩٢ بووەتە ئەندامی پەرلەمانی کوردستان تا ساڵی ٢٠٠٥.
- ساڵی ٢٠٠٩ خەڵاتی بلەی بۆ کەسایەتیی ساڵ لە بواری ئەدەبدا وەر گرتووە.

# چەند پرسیارێکی تایبەت لە دکتور عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ

*** یەکەم کتێب کە خوێندووتەوە.**

– لە پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بووم، «کەمانچەژەن»ی پیرەمێرد کە بە ئەڵقە لە «ژین»دا بڵاو دەبوەوە، یەکەم کتێب بوو.

*** کێ بە یەکەم مامۆستای خۆت دەزانی؟**

– باوکم.

*** یەکەم هاوڕێت؟**

– کۆمەڵێک هاوڕێم هەیە لە کورد، عەرەب و ئازەریش، بەڵام ڕەنگە لەوانەی زۆر دەمێکە پێکەوەین «د. کەمال فوئاد» و «محەمەدی مەلا کەریم» لە ڕیزی پێشەوەیان بن.

*** چ کاتێك زۆر خەمبار بووی؟**

– کە لە دەرەوەی وڵات بووم هەواڵی کۆچی دوایی باوکم بیست، زۆر کاری تێکردم، هەروەها شەهیدبونی د. عەبدوڕەحمانی قاسملوو و فازیلی مەلا مەحموودی ئامۆزام، چونکە یەکێک لە هاوڕێکانی ترم کە زۆر خۆشدەویست بوو د. قاسملۆ بوو.

*** لە چی پەشیمانی؟**

– شتێک نییە کە بڵێم کردوومە و لێی پەشیمانم.

*** ئاواتی گەورەت چییە؟**

– پیاوێکی قەومی نیم، بەڵام ئاواتی گەورەم سەرکەوتنی گەلی کوردە.

*** چرکەساتێك کە چێژت لێ وەرگرتبێ لە ژیاندا؟**

– لە نێو جێگادا کەوتبووم، ڕادیۆی گەلی کوردستان وتی: ((مژدە مژدە سلێمانی ئازاد بوو)). یەکسەر دەستم کرد بە گریان، ئەوە لە خۆشترینەکانە بۆ من. هەروەها ١٤ی تەمووزیش لە شام بووین، سەرئەکەوتم بەرەو «قاسیون»، خەڵکم ئەدی لە دەوری ڕادیۆ کۆبوونەتەوە. چووم بۆلایان، وام زانی باسی لوبنانە، کە وتی زەعیم عەبدولکەریم قاسم، پرسیم ئەوە چییە؟ کابرا وتی: ئەوە نووری سەعیدیان لابرد. ئیتر من لەخۆشیدا گەڕامەوە و نەڕۆیشتم بۆ ماڵی هاوڕێکەم. چایخانەیەک هەبوو لەوێ دائەنیشتین، لەوێ هەر عیراقی بوو بە کورد و عەرەبەوە یەکتریان ماچ ئەکرد، کەوتینە گریان. عەبدوڕەحمانی زەبیحی هات و دەستی کردە ملم و وتی: ((جەناب ئیتر برسیەتی نەما.))



د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، مۆسکۆ ١٩٦٢







ئەوەی ڕاستی بێت، پێویست بوو (بیبلیۆگرافیا)ی کتێب و بەرهەمەکانی (د.عیزەدین) ئامادە بکەین، بەڵام بە هۆی ئەوەی وا بە باش زانرا خۆی ئامادەی بکات.. وازمـان لێ هێنا و بە هەمان شێوازی ژمارەکانی دیکەی ڕۆڤـار، ئەم بیبلیۆگرافیایەمان ئامادەکرد:

١- ئەو بیبلیۆگرافیایەی چەند ساڵێکە کاری لەسەر دەکەین تەنها لە بارەی (کتێبی کوردی) یـەوەیـە -لــە ســەرەتــاوە تــاکــو ســاڵــی ٢٠١٠، هەروەها گۆڤار و ڕۆژنامەی نەگرتووەتەوە، تەنها ئەوانەی گرتووەتەوە کە وەک (کتێب) دووبارە چاپ کـراونـەتـەوە. لە هەمان کاتدا، جگە لە کتێب بە زمانی کـوردی، هیچ زمانێکی دیکەی نەگرتووەتەوە.

٢- لە ئامادەکردنی دەستنووسی (بەرگی سێیەم-ئەدەب)دا (دیوان)ی شاعیرانی نەگرتووەتەوە، هەروەها ئەو کتێبانەشی نەگرتووەتەوە کە تەنها بەرهەمی شاعیرانیان کۆکردووەتەوە، بێگومان لەبەر ئەمەیە کە لێکۆڵەران لە دۆزینەوەی دیوانی شاعیراندا دانامێنن.. بەڵکو ئەوە بەلامانەوە جێی بایەخ بـووە کە نـووسـەران و لێکۆڵەران لـەو بابەتانە ئـاگـادار بکەینەوە کە لەبارەی شاعیرانی کوردەوە نووسراون، لە هەمان کاتدا، ئەو دیوانانەی گرتووەتەوە کە جگە لە کاری کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی بەرهەم و هۆنراوەی شاعیرانی کـورد، کـاری لێکۆڵینەوە و ساغ کردنەوەیان ئەنجام داوە.

٣- لە ئـامـادەکـردنـی ئـەم بیبلیۆگرافیایەدا، هەوڵی ئەوە دراوە هەرچی پەیوەندی بە (د. عیزەدین)ەوە هەبێت لە ماوە و سنووری پرۆژەی بیبلیۆگرافیاکەمان کۆبکرێتەوە، واتـە: کتێبی سـەربـەخـۆ، بـابـەت (ئـەو بابەتانەی کـە ئەو نووسیونی و لە کتێبی دیکەدا بڵاوبوونەتەوە، پێشەکی «مەبەست لەو پێشەکیانەیە کە ئەو بۆ

کتێبی دیکەی نووسیوە» سەرپەرشتیکردن، ڕەخنە، وتار.. هتد. پێویستە لەم خاڵەدا ئەم سەرنجەش بنووسین: بێگومان دکتۆر نووسینی دیکەی هەیە و (پێشەکی) بۆ کتێبی دیکەش نووسیوە، بەڵام هەروەک پێشتر ئاماژەمان پێکرد، سنوور و مەودای پرۆژەی بیبلیۆگرافیاکەی ئێمەش دیاریکراوە، واتە توانیومانە تەنها ئەو بابەتانە بدۆزینەوە کە بەپێی میتۆدی پرۆژەکەمان، کەوتوونەتە نێو دە بابەتی سەربەخۆ لە بارەی (کورد و کوردستان)ەوە.

٤- لەم بیبلیۆگرافیایەدا، بە پێچەوانەی بیبلیۆگرافیا سەرەکییەکە، ناونیشانی کتێبەکانیش بەپێی ڕێنووسی ئێستا نووسراونەتەوە.

٥- ئەم بیبلیۆگرافیایە بەپێی ساڵ ئامادە کراوە. لە ناسنامەی کتێبەکاندا، ئەم چەند هێمایە بەکارهاتوون: (چاپ: نۆرەی چاپ واتە چاپی یەکەم و دووەم، چ: چاپخانە، ش: شوێن، س: ساڵ) هەروەها بۆ هەر سەرنج و تێبینییەکی تر لە بارەی ناساندنی سەرچاوەکانەوە، خوێنەر دەتوانێت بۆ ئەم کتێبە بگەڕێتەوە: بیبلیۆگرافیای ناسێنراو و پۆلێنکراوی کتێبی تایبەت بە کورد و کوردستان: ١٩٢٥-٢٠١٠ «بەرگی یەکەم: مێژوو» ئامادەکردن: بوار نورەدین، چاپی یەکەم- چاپخانەی «سەردەم» سلێمانی-کوردستان، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠١٢.

٦- بە پێویستمان نەزانی لەگەڵ هەموو (ناو) هێنانێکی ئەودا، ناوی تەواوی بنووسین، بەڵکو تەنها بە (د.عیزەدین) ئاماژەی پێ کراوە.

## کتێبی سەربەخۆ لە بارەی (د.عیزەدین)

١- چەپکێ ڕەخنە لە کتێبی ئوستاد، نووسین: مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای هەواڵ بۆ ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەوانی، چاپ: یەکەم، چ: تیشک، ش: ؟، س: ٢٠٠٥.

ناوەرۆک:

پێشەکی: شوان داودی (لێرەدا نووسراوە: «ئوستاد» کتێبێکی «د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ»ە لە ساڵی ١٩٩٧ لە سلێمانی لە چاپخانەی «سەفوەت» لەسەر




ئەرکی «مام جەلال» چاپ کراوە. بۆ وەڵامی «ئوستاد»، نەمر مامۆستا «مەلا جەمیل» لە ١٩٩٨/١/١٩ لە بەغداوە بابەتێکی بە ناوی «چەپکێ ڕەخنە لە کتێبی ئوستاد» ناردە سلێمانی و بە تایبەت بۆ گۆڤاری «ئێستا» کە د.عیزەدین خاوەنی ئیمتیازی بوو، لەبەر دۆخی خۆی لە بەغدا نازناوی «هەڵگورد»ی خستبووە سەر بابەتەکە،

بەداخەوە هەم ئەو بابەتە بەنرخە ڕووناکی نەبینی هەم «ئوستاد» بە ناتەواوی مایەوە. لە ڕوانگەی خزمەتکردن بە مێژووی ئەدەبی کوردی و وەک وەفایەک بۆ گیانی بێگەردی مامۆستا «مەلا جەمیل» لە دەزگای «هەواڵ» بڕیارماندا ئەو بابەتە بەنرخە بە چاپ بگەیەنین) چەپکێ ڕەخنە لە کتێبی ئوستاد لەسەر بەرگی دواوە کورتەیەک لە ڕەخنەکە دانراوە.

٢- د.عزەدین مستەفا ڕەسووڵ ڕووبارێک لە داهێنان، ئامادەکردن و بڵاوکردنەوە: مەکتەبی ڕۆشنبیری حزبی



شیوعی کوردستان، چاپ: یەکەم، چ: بینایی، ش: سلێمانی، س: ٢٠٠٩.

**ناوەرۆك:**

ڕێزلێنان لە ڕووبارێک: مەکتەبی ڕۆشنبیریی ح.ش.ک/ ژیاننامەی ڕێزلێنراو/ هەندێ بابەتی وەک: پ.د.عیزەدین و شاکارەکەی (الواقعیە فی الادب الکردی): کەریم شارەزا/ ڕێزلێنانی د.عیزەدین: کەمال غەمبار/ تێکۆشەرێکی دێرین و مامۆستایەکی بەتوانا و نووسەرێکی بیرتیژ: جەلال دەباغ/ وێنەی بەرگی بەشێک لە کتێبە بڵاوکراوەکانی د.عیزەدین.

ئەم کتێبانەش، ئەوانەن کە بابەتی ئەویان تێدایە

١- پێشمەرگە لاپەڕەیەکە لە خەباتی نەتەوەی کورد بەرامبەر ئاغاوات و داگیرکەران لە دەوروبەری جمهووریەتی دیموکراتی کوردستاندا، نووسین: د.ڕەحیمی قازی، لەسەر ئەرکی (عەلائەددین سەجادی) چاپ کراوە، چاپ: یەکەم، چ: الوفاء، ش: بەغداد، س: ١٩٦١. پێشەکی: د.عیزەدین.

٢- مەلای گەورە مەلا محەممەدی کۆیی ١٨٧٦- ١٩٤٣، نووسین: مومتاز حیدری، بە یارمەتی وەزارەتی ڕاگەیاندن (بەڕێوەبەرێتی گشتیی ڕۆشنبیری کوردی) چاپ کراوە، چاپ: یەکەم، چ: شارەوانی، ش: هەولێر، س: ١٩٧٥. پێش وتارێک: د.عیزەدین.

٣- ئاوڕدانەوەیەک لە بزووتنەوەی (هەقە) نووسین: مستەفا عەسکەری، پێداچوونەوە و پێشەکی و پەراوێز: محەممەدی مەلا کەریم، لەگەڵ دوو پاشبەند بە خامەی مامۆستا هەمزە عەبدوڵڵا و د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، چاپ: یەکەم، چ: عەلا، ش: بەغدا، س: ١٩٨٣. پاشبەندی دووهەم: د.عیزەدین.

٤- شێخ نووری دەنگی ڕەسەنی شیعر، نووسین: موسڵح مستەفا جەلالی، لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن- دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، چاپ: یەکەم، چ: دارالحریە، ش: بەغداد، س: ١٩٨٤. شتێک بۆ پێشەکی: د.عیزەدین.

٥- یادی سەجادی- سەرجەمی ئەو وتارانەیە لە ئاهەنگی چلەی کۆچکردوو مامۆستا (عەلائەددین سەجادی)دا خوێنرانەوە یا بە بۆنەی کۆچکردنی و لە یادیدا لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا بڵاوکراونەتەوە، کۆکردنەوە: دلێر عەلائەددین سەجادی، بە یارمەتی ئەمینداریێتیی گشتیی ڕۆشنبیری و لاوان چاپ کراوە، چاپ: یەکەم، چ: اشبیلیە، ش: بەغداد، س: ١٩٨٧. وتاری د.عیزەدین/ ئەوانەی مردن و نامرن: د.عیزەدین.

٦ - شاری سلێمانی- بەرگی یەکەم، نووسین و کۆکردنەوە: ئەکرەمی مەحموودی ساڵحی ڕەشە، پێداچوونەوە و پێشەکی: د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، چاپ: یەکەم، چ: دارالحریە، ش: بەغداد، س: ١٩٨٧.

٧- شیعر و ئەدەبیاتی کوردی، نووسین: ڕەفیق حیلمی، چاپ: دووەم، چ: التعلیم العالیی، ش: بەغداد، س: ١٩٨٨. دوو وشە: د.عیزەدین.

٨ - میهرجانی مەولەوی، ئامادەکردن: محەممەدی مەلا کەریم، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی- گۆڤاری ڕۆشنبیری، چاپ: یەکەم، چ: الزمان، ش: بەغداد، س: ١٩٨٩. مەولەوی- بەرهەمی و شتێک دەربارەی سروشت: د.عیزەدین.

٩ - شاری سلێمانی- بەرگی دووەم، نووسین و کۆکردنەوە: ئەکرەمی مەحموودی ساڵحی ڕەشە، پێداچوونەوە و پێشەکی: د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، چاپ: یەکەم، چ: دارالحریە، ش: بەغدا، س: ١٩٨٩.

١٠- ئافرەت لە هۆنراوەی کوردیدا، نووسین: فوئاد حسێن ئەحمەد، پێداچوونەوە و سەرپەرشتی: د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، چاپ: یەکەم، چ: الجاحز، ش: بەغداد، س: ١٩٩٠.

١١- هونەرمەند محەممەد عارف، ئامادەکردن: دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوە، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، چاپ: یەکەم، چ: الآدیب، ش: بەغداد، س: ١٩٩٠. هونەری ئەم سەردەمەی عێراق- نووسین: د.نورا جەواهر حاجی جندی/ وەرگێڕانی: د.عیزەدین.

١٢- فیستڤالا خانی- دهوک ٢٠-٢٣/ حزیران/ ١٩٩٥، ئامادەکردن: ڕێڤەبەرییا گشتی یا ڕەوشەنبیری و هونەری- دهۆک، چاپ: یەکەم، چ: هاوار، ش: دهۆک،

س: ١٩٩٦ ڤەکولین (بێ ناونیشان): د.عیزەدین.
١٣- ستەمکردن لە حاجی قادری کۆیی تاوانە، نووسین: خالید دلێر، چاپ: یەکەم، چ: سەفوەت، ش: سلێمانی، س: ١٩٩٧. برای خۆشەویستم کاک خالید: د.عیزەدین.
١٤- ژیان و بەسەرهاتی عەبدولڕەحمان زەبیحی (مامۆستا عولەما)، نووسین: عەلی کەریمی، چاپ: یەکەم، چ: زاگرۆس گۆتنبێرگ، ش: سوید، س: ١٩٩٩. د.عیزەدین.
١٥- یادگاری خانەقا - یاداشت و شیعر، نووسین: شێخ ڕەئووف شێخ سەعیدی خانەقا، کۆکردنەوە و داڕشتن: کەمال ڕەئووف محەممەد، ئامادەکردنی بۆ چاپ: بنەماڵەی شێخ مەلیکی شێخ ڕەئووفی خانەقا، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیریی گەلاوێژ، چاپ: یەکەم، چ: داناز، ش: سلێمانی، س: ٢٠٠٠ شێخ ڕەئووفی خانەقا مەشخەڵێکی شاری کەرکووک بوو: د.عیزەدین.
١٦- میهرەجانی مەولەوی، ئامادەکردن و بڵاوکردنەوەی: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپ: یەکەم، چ: وەزارەتی ڕۆشنبیری، ش: سلێمانی،




س: ٢٠٠٠. پێشەکی: د.عیزەدین.
١٧- میهرەجانی مەولەوی، ئامادەکردن و بڵاوکردنەوە: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپ: دووەم، چ: وەزارەتی ڕۆشنبیری، ش: سلێمانی، س: ٢٠٠٠. پێشەکی: د.عیزەدین.
تێبینی: ئاماژە بە چاپی دووەم نەکراوە تەنیا لە لاپەڕە ٢دا تێبینیان بۆ نووسیوە کە لەبەر گرنگی کتێبەکە چاپیان کردووەتەوە.
١٨- ڕۆژنامەنووسیی کوردی سەردەمی کۆماری دیموکراتی کوردستان ١٩٤٢-١٩٤٧، نووسین: د.هیمداد حسێن، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپ: یەکەم، چ: ش: سلێمانی، س: ٢٠٠٢. ئەم کتێبە نامەی دکتۆرای (هیمدادی حسێن)ە بۆ ئەنجوومەنی کۆلێجی زمان لە زانکۆی سلێمانی بە سەرپەرشتی (د.عیزەدین) ئامادە کراوە.
١٩- ئەلبوومی مەکتەبی فەیسەڵییە، ئامادەکردن: بەختیار جەلال، لە بڵاوکراوەکانی شارەوانی سلێمانی، چاپ: چ: بەرهەم، ش: سلێمانی، س: ٢٠٠٣. چەند یادگارێک لە بیرەوەریی مەکتەبی فەیسەڵییەدا: د.عیزەدین.
٢٠ - بیبلیۆگرافیای کتێبی فۆلکلۆریی کوردی ١٨٦٠-٢٠٠٤، ئامادەکردن: بوار نورەدین، پێداچوونەوە و پێشەکی: پ.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، پرۆژەی کتێبخانەی ئنستیتیوتی کەلەپووری کورد - لە بڵاوکراوەکانی ئنستیتیوتی کەلەپووری کورد، چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، س: ٢٠٠٤. لە بارەی بیبلیۆگرافیاوە وتراوە: د.عیزەدین.
٢١ - ڕەخنە و ئایدیۆلۆژیا، نووسین: حەیدەر حاجی خدر، لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکری و ئەدەبی نما، چاپ: یەکەم، چ: دیلان، ش: هەولێر، س: ٢٠٠٥ د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ و پیادەکردنی پێوەری ئایدۆلۆژیا لە ڕەخنەدا.
٢٢ - فێستیڤاڵی هەژار موکریانی، ئامادەکردن: شەماڵ حەویزی و کەریم سۆفی، لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرایەتی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر، چاپ: یەکەم، چ: و-ڕۆشنبیری، ش: هەولێر، س: ٢٠٠٥. تەوەری چوارەم- هەژار و وەرگێڕان- بابەت لەلایەن: پ.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ - شکور مستەفا.



٢٣ - ئەندازیار نوری کاکە حەمەی ئەمینی عەتار شاعیر و مێژووزان- ئەرشیفەوانی قایمکار، کۆکردنەوە و ئامادەکردن: د.محەممەد نووری عەتار، لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری - بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، چاپ: یەکەم، چ: ڕۆمان، ش: سلێمانی، س: ٢٠٠٧ دوو وشە بۆ یاد و بەرهەمی (بێباک): د.عیزەدین.

٢٤- گۆران لە یادەوەری هاوچەرخەکانیدا، ئامادەکردن و کۆکردنەوە و پێشەکی بۆ نووسینی: مامۆستا جەعفەر و ڕێبوار حەمەتۆفیق، چاپ: یەکەم، چ: حەمدی، ش: سلێمانی، س: ٢٠٠٧. د.عیزەدین.

٢٥ - زەرتەشت، نووسین: عەبدوڵڵا قەرەداغی (مەلا عەلی)، چاپ: دووەم، چ: تیشک، ش: سلێمانی، س: ٢٠٠٧. چەند دێڕێک: د.عیزەدین.

تێبینی: چاپی یەکەم لەساڵی ١٩٩٧ لە (ستۆکهۆڵم) چاپ کراوە و دەستمان نەکەوتووە.

٢٦- مێژووی وێژەی کوردی- بەرگی سێیەم، نووسین: د.سدیق بۆرەکەیی (سەفی زادە) لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، س: ٢٠٠٨. د.عیزەدین.

٢٧ - وتارناسی، نووسین: سالار عوسمان، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای موزیک و کەلەپووری کوردی، چاپ: یەکەم، چ: دارالمعرفە، ش: بەیرووت، س: ٢٠٠٩. سەرەتایەک: د.عیزەدین لەسەر بەرگی دواوە بەشێک لە نووسینەکەی (د.عیزەدین) دانراوە.

٢٨ - مەلای گەورە (مەلا محەمەدی کۆیی ١٨٧٦- ١٩٤٣)، نووسین: مومتاز حەیدەری، پێشەکی: د.عیزەدین مسەفا ڕەسووڵ، پێداچوونەوەی: کەریم شارەزا، چاپ: دووەم، چ: ڕۆژهەڵات، ش: هەولێر، س: ٢٠٠٩.

٢٩ - نالی هەر لە لوتکەدایە - بەرهەمەکانی دیداری حەزرەتی نالی کە لە ڕۆژانی ١-٣/٧/٢٠٠٦ لەلایەن سەنتەری ڕووناکبیری ئێل بەگی جافەوە ڕێک خرا، ئامادەکردن: م.عەلی، لە بڵاوکراوەکانی (گۆڤاری کۆچ)، چاپ: یەکەم، چ: حەمدی، ش: سلێمانی، س: ٢٠٠٩. دوو چامەکەی نالی و سالم - دوو نامە یاخود دوو چامەی شیعرییە: د.عیزەدین.

٣٠ - چی لەبارەی (محەممەدئەمین زەکی بەگ)ەوە نووسراوە، ئامادەکردن: ڕەفیق ساڵح، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین، چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، س: ٢٠٠٩. ئەمین زەکی و ئەدەب: د.عیزەدین.

٣١- بەر لە ڕاپەڕین لە یادی چلەی (کامەران موکری) دا هەڵوێستی شاعیر و ئەدیبانی کورد، پێشەکی و ئامادەکردن: د.عەبدوڵڵا ئاگرین، چاپ: یەکەم، چ: نازە، ش: هەولێر، س: ٢٠١٠. کامەران موکری: د.عیزەدین.

٣٢ - نەتەوە و دەوڵەت و ئایین لە هزری ئەحمەدی خانی (١٦٥٠- ١٧٠٧)دا، نووسین: د.فەهمی شوکری عەبدوڵڵا، لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان - بەڕێوەبەرایەتی گشتیی ڕۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە، چاپ: یەکەم، چ: ڕۆشنبیری، ش: هەولێر، س: ٢٠١٠. پێشەکییەک: د.عیزەدین.

٣٣ - پیاوێک گرەو لە نەمری دەباتەوە - مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس لە فێستیڤاڵێکی تایبەت بە کۆمەڵەی ڕووناکبیری کەرکووک ساڵی ٢٠٠٦، ئامادەکردن: ساڵح هەللاج، پێداچوونەوە: محەممەدی مەلا کەریم، لە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی ڕووناکبیری و کۆمەڵایەتی کەرکووک، چاپ: یەکەم، چ: کارۆ، ش: سلێمانی، س: ٢٠١٠. وتاری د.عیزەدین.

٣٤ - ڕۆژنامەوانیی کوردی - کۆواری دەفتەری کوردەواری ١٩٧٠، ئامادەکردنی: هیمدادی حسێن، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، س: ٢٠١٠. عەلی حەریری: د.عیزەدین...

٣٥. ڕۆژنامەوانیی کوردی- گۆڤاری هیوا ١٩٥٧- ١٩٦٣/ بەرگی یەکەم، لێکۆڵینەوە و ئامادەکردن: د.هیمداد حسێن، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، س: ٢٠١٠. پاشکۆ: نامەی د.عیزەدین.

٣٦ - ڕۆژنامەوانیی کوردی- گۆڤاری هیوا ١٩٥٧- ١٩٦٣ بەرگی پێنجەم، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، س: ٢٠١٠ مامۆستا و زانای کورد دوکتۆر (بەکایف): د.عیزەدین.

# ئەزموونی نووسینم



د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ

لەو کاتەوە کە بەمەبەستی نووسین یا بەرهەمی ئەدەبی نووسین دەستم داوەتە قەڵەم هەمیشە نووسین دەربڕینی ئەندێشە و هەڵچوونی دەروون و ئەنجامی بیرکردنەوە بووە. بیر و ئەندێشە و هەڵچوونەکە لێکدانەوە یا هەر لەخۆوە چووەتە سەر کاغەز و بابەت و ڕوخساری خۆی دۆزیوەتەوە. بێ گوێدانە ئـەوەی ڕوخسار و بابەتەکە ئەدەبی بن یا ڕۆژنامەنووسی.

نازانم لەبەر فەقیری یا باوی شیعرە کە زۆربەی خاوەنانی قەڵەم بە شیعر دەستیان پێکردووە. منیش لەو چەشنە شیعرە ساکارەم لەبیرە. بەڵام لەڕاستی یادگار و بیرەوەریدا دەبێ بڵێم – پێش شیعر بە نووسین لە ڕۆژنامەی دیواری قوتابخانە سەرەتایەکەمدا دەستم پێکرد. بەشدارییەکی ساکاری تری پەندی پێشینان و وشەی کوردی بۆ گۆڤاری گەلاوێژم بیرە. کە دیارە بڵاو نەکرانەوە.

لە پێشەکیی کۆمەڵە بەرهەمی ئەدەبی «ڕازی دووری»دا کە ساڵی ١٩٦٨ چاپم کردبوون نووسیبووم:

«بەرهەمی ئەدەبی بەلای نوسەر و شاعیرەوە هەستێکی دەروونە. وشەی جوان تەوژمی دەربڕینێتی. ژانری ئەدەبی (واتــە –بابەت)ی ئەدەبی قاڵبی داڕشتن و چوارچێوەی خستنە بەرچاوێتی. هونەرمەند ئەنووسێ و ئەبێ هەر ئەوەی لێ داوا بکەیت کە ڕادەی نووسینی کزو نزم نەبێت. بەڵام هەستی دەروون ئەخاتە کام قاڵبەوە و چ «ژانر»ێک بەرهەم ئەهێنێ ئەوە ئیشی ڕەخنەگرە و لە یەکیان جیا ئەکاتەوە و ناویان لێ ئەنێ.»

جارێک شتێکم بەناونیشانی «من و شیعر»ەوە نووسی. هەر بەشێک لەو نووسینە دەبێ بە پێشەکیی بە شیعر هەست دەربڕین کە لەدەیان ساڵدا دیوانێکی بچووکی دروستکردووە کە هەڵسەنگاندنی خۆم، یا ڕەخنەگران هەرچییەک بێت ئەوا هەر هەستی ڕاستەقینەیە و ئەنجامی ئەندێشەی ڕاستەقینەیە و کەڵکی بڵاوکردنەوەی هەیە.

هەرچی چیرۆکیشە. ئەوەش ناونیشانی «من و چیرۆک»ێکی لێم دەوێت کە لەجێی خۆیدایە ببێت بە پێشەکی ئەم کۆمەڵە بەرهەمەی ڕەنگە ناوبنرێن چیرۆک، خۆ ئەگەر ئەو ناوەیشیان لێ نەنرا ئەوا لەو چەشنە بەرهەمە ئەدەبیانەن کە ئەنجامی بیر و ئەندێشەیەکی ڕاستەقینەن و شایانی بڵاوکردنەوەن.

کە دەستەی ئێمە هاتینە کۆڕی خوێندنەوەوە. بە کوردی هەرچەندە چیرۆک هەبوو. کەسمان چیرۆکەکانی سەرەتای دەست پێکردنمان نەدیبوو بەڵام چیرۆکنووسانی «گەلاوێژ»مان دەناسی. کانی ئاگاداربوونمان لە هونەری چیرۆک هەر زمانی عەرەبی بوو. بە چیرۆکی عەرەبی عێراق و وڵاتانی تری عەرەبەوە بەو وەرگێڕانە کەمانەی چیرۆکی جیهانییەوە بە عەرەبی. ڕەنگە هەر ئەوەش بێت وای لە من کردبێ کە بە عەرەبی دەست بدەمەوە چیرۆک نووسین.

لە پێشەکی دیوانی کاکەی فەلاحی نەمردا باسی ساڵی ١٩٤٩ و

سەرەتای پەنجاکان و کۆبوونەوەی کۆمەڵێ ئەدەبدۆستی لاوم کرد لە دەوری هەردی مامۆستامان و لە دوکانە هاوبەشییەکەی خوا لێ خۆشبوو شێخ کەریمی مەحموودی بەرزنجی و تۆفیق محەمەدی بەرگدرودا. ئەم چیرۆکی «من و چیرۆک»ەش هەر لەوێوە دەست پێدەکات.

یەکێک لەو برایانەی ئەو کۆڕ و یانەیە چیرۆکێکی درێژی نووسیبوو. هەر خۆشی وەک شیعر لەبەری کرد بوو. ئەو برایە لە من بەتەمنتر بوو، بەڵام دوو ساڵی بەندیخانە بردنەسەر لەگەڵ مندا لەیەک پۆلی قوتابخانەی شەودا کۆی کردبۆوە. من نەمدەوێرا بڵێم چیرۆکەکە ساکارە و بەپێی ئەوکاتەش هونەری چرۆکی کزە چونکە دوا وتە هەر لە هەردیی مامۆستامان دەبیسترا. برادەرەکەشمان ئەوکاتە پلەی زانینی سیاسیی زۆر لە من بەرزتر بوو. دەمێک بوو پرۆژەی چیرۆکێک لەسەر یەکێک لە شێتەکانی شار لەمێشکمدا گینگڵی دەخوارد. چوومەوە ماڵەوە و بۆ سبەینێ کە دەوری مەکینەی بەرگدروونەکانماندا منیش چیرۆکی خۆم خوێندەوە.

پەسەند کردنی مامۆستا هەردی سەرسامی کردم. دیار بوو شێخ کەریم لەمن سەرسامتر بوو. بەڵام کاک تۆفیق ئەوەندە زیرەک بوو کە بزانێ من لەوانیتر باشترم پێدەنووسرێ.

ئەمەشی لەدڵدا پێ خۆشتر بـوو. کە مامۆستا هـەردی فەرمووی: جیاوازی نێوان ئەم و ئەوان زۆرە. ئیتر قسەشی بڕییەوە. مەدالیاکەیشی کرد بەیەخەی مندا.

ئەو مەدالیایە کاری خۆی کرد ئەو ساڵە هەر بەهاندانی مامۆستا هەردی لەلایەکەوە چەند چیرۆکیترم نووسی. لەلایەکەوە نیازم وابوو وا بخوێنم کە خەوی چوونە (سۆربۆن) بهێنمەدی. بەڵام لە ١٩٥١/٣/١٧دا گیرام، لە ١٩٥١/٦/٤ لە بەغدا لە مەحکەمە ڕزگارمان بوو. ١٩٥١/٦/٩ تاقیکردنەوە بوو. ئەو خوێندنەم بۆ ڕەخسا و ئەو خەوە سەرینەگرت. گرتن و بەندیخانەکە چەند چیرۆکیتری پێوە بوو. کە بۆ ساڵی دوایی چوومە زانستگای بەغدا وردە وردە چیرۆکەکان زیاد دەبوون. بەڵام نازانم بۆ بڵاوم نەکردنەوە. تا سەرەتای ساڵی دووەمی خوێندنم کۆمەڵە چیرۆکێکی باشیان لێ دروست بوو. بە خەیاڵی خۆم دەچوونە ڕیزی چیرۆکەکانی عەبدولڕەزاق شێخ عەلی و عەبدولسەمەد خانەقاوە دوو نوسخەم لێ نووسیبوونەوە. یەکەمیانم دا بە ئاشتیخوازان بەو نیازەی لایان پەسەندبێ و چاپی بکەن. کە پاش چەند مانگێک لە بەندیخانەی بەغدا لەگەڵ تێکۆشەری شەهید عەتشان ئزێرجاویدا پێکەوە بووین و ئەو ئەوسا دینەمۆی بزووتنەوەی ئاشتیخوازان بوو بەشانازییەوە باسی ئەوەی کرد کە ئەگەر ڕاپەڕینی تشرین نەبووایە ئێستا ئەو کۆمەڵە چیرۆکەم چاپکرابوو. بەڵام ڕاپەڕینەکە هەر ئەوە نەبوو ببێتە هۆی چاپنەکردن. بەڵکو کە پاش ڕاپەڕین چەند مانگێک خۆم شـاردەوە و دوایی چوومە بەندیخانە ناچار بووم نوسخەی دووەم بشارمەوە. ئەو کارەم دایە دەست هاوڕێی منداڵی و دراوسێی ماڵ بەماڵەوەمان دکتۆر جوامێر مەجید سەلیم کە لەپاش ماوەیەکی درێژ کەوتمەوە ناو ژیانی ئاساییەوە و لەگەڵ کاک جوامێردا شتە شاردراوەکانمان لەو چاڵەی تەویلەکەی ماڵی خۆیان دەرهێنا تەواو پوابوون و هیچی نەدەخوێندرایەوە. ئەمیش وەک گەلێک بەرهەمی ترم سەری تێداچوو.

ئەوەندەش دەبێ بڵێم کە لەبەندیخانە باسی ئەو کۆمەڵە چیرۆکەم دەکرد شەهیدی نەمر جەمال حەیدەری لێی پرسیم بەچ زمانێک نووسیووتە کەوتم بە عەرەبی پاش پرسین و موناقەشە دەرسێکی گەورەی ژیانمی دامێ.

کە بەرهەمی ئەدەبی بە کوردی بنووسم و عەرەبی زانین بۆ خزمەت و پێناسی کورد بەکاربهێنم. لەوانەبوو ئەگەر ئەو کۆمەڵە چیرۆکەم دەست بکەوتایەتەوە هەر لەسەر ئەو ڕێ و شوێنە بمکردنایە بە کوردی و بەکوردی بڵاوم بکردنایەتەوە. ئەوسا لەپاڵ هەموو ساکارییەکیاندا دەبوونە یەکەم کۆمەڵە چیرۆکی چاپکراوی کوردی.

ئێستا کەسکێچی هەندێکیانم لەبەرچاوە و تازە لەو پلەیەدا نین بیاننووسمەوە. هەر لەبەرئەوەی نووسەر بەرهەمەکانی خۆی بە کۆرپەی خۆی دەزانێ فرمێسکێکیان بۆ دەڕێژم و دێمە سەر باسی ئەم چیرۆکانەی بەردەستتان.

ئەمانە هەندێکیان کۆنن و بـڵاوکراونـەتـەوە. بەکاتی بڵاوکردنەوەیاندا دیارە کە لەچ سەردەمێکدا نووسراون. بەڵام کە ئەم بەرگە سەرجەمی ئەو بەرهەمانەم دەگرێتەوە کە سەر بەچیرۆکن ئەوا پێم باشبوو ئەوانەش دووبارە چاپ ببنەوە. هەرچی ئەوانیتریشن ئەوە بەرهەمی سەردەمێکی پاش ئەوانن کە یان دەرفەتی بڵاو کردنەوەیان نەبووە یا تەمەڵیم لە بڵاوکردنەوەیاندا کردووە. بناغەی زۆربەیان لەسەر بیری نووسەرێک دانـراوە کە وتـبـووی: ئەگەر چیرۆکنووس لەواقیعدا کەرەسەی چیرۆکی دەستنەکەوت با خەو بکا بە چیرۆک. ڕەنگە هەندێک لەمانە کەرەسەکەیان لەخەوێکەوە وەرگیرابێ. بەڵام دیارە چۆن خەو و واقیع تێکەڵ کـراون. ناشمەوێ بچمە سەر لێکدانەوەی خەو و لێکدانەوەی چیرۆکەکان بەڵام ئەو بیرە بوو بە بناغە و ئەم چیرۆکانەی لەسەر بەرهەم هێنرا. دیسان نامەوێ بڵێم ئەمانە چیرۆکن یا چ بابەتە چیرۆکێکن هیوام وایە ڕەخنەگران بە ئینسافەوە تەماشای ئەوە بکەن و لەبیریان نەچێ کە دوا بڕیاری ڕەخنەگرانە لای من بەسەر بەرهەمی ئەدەبیدا ئەوەیە ئایا بەرهەمی چاکە یا خراپ ئیتر دەربەستی ئەوە نیم ناوبنرێ چیرۆکی باش، ڕێپۆرتاژی باش... هتد، لەم کۆمەڵە بەرهەمەدا ئەو بەرهەمە درێژە دەبینن کە ناونراوە «ئوستاد». دیارە ئەوەیان لا ڕاوەستاون و باسێکی دەوێت. (١)

١ — بڕیار وابوو ئەم چیرۆکانە و ڕۆمانی ئوستاد پێکەوە چاپ بکرێن. بەڵام بەخت و چاپ نەیانهێنا و ئەم چیرۆکانە کەوتنە دواوە. بەڵام لە پێشەکییەکە ئەوەی پێوەندیی بە چیرۆکەکان و ڕۆمانەکانەوە هەیە هێشتمەوە و هەر ئەوەشم هەیە لە بارەیانەوە.

# چەند وشەیەکی شەرمن، بۆ مرۆڤێکی بەخشندە...!



جەمال عەبدول　　　　د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ

## جەمال عەبدول

بیرمە، هێشتا قوتابیی پۆلی دووەم و سێیەمی سەرەتایی بووم، بۆ یەکەمجار کاک عیزەدینم لە دوکانی خوالێخۆشبوو مامە شێخ عارفی قەرەداخی بازرگان بینی، کە لەتەنیشت دوکانی خەیاتییە -کەی باوکمەوە بوو لە قەیسەری وەسمان پاشا، جاروبار لەگەڵ شێخ حەسیب قەرەداخی ئەهاتن بۆلای شێخ ڕەوفی کوڕە گەورەی هاوتەمەنیان کە ئەویش، ماوەیەکی باش پێکەوە ئەمانەوە و کاتەکەیان بە باسی شیعر و ئەدەب و شەڕە - شیعر بەسەر ئەبرد، کاک عیزەدین فێستێکی سوور و مێزەرێکی سپی جوان تێوە ئاڵاوی لەسەردا بوو، وەک نەریتێک تا ئێستایش باوی قوتابێتی کۆلیجی شەریعەیە، بەڕاستی خودی ئەو شەڕە شیعر و پێشبڕکێیە، سەرنجی کاڵ و کرچی ئەوکاتەی منی ڕائەکێشا، وەک گوێگرێکی پەی بەو کارە نەبردوو، بەڕادەیەک تا کۆتایی دانیشتنەکە چاوی پرس و پەرۆشم تێ ئەبرین و بەدیاریانەوە دائەنیشتم و حەزم ئەکرد جاری تریش بیانبینم..!

ڕۆژگار هات و ڕۆیشت، بەڵام خۆشیی بگرە و بەردەی ئەو دانیشتنانەیان تا ئێستایش لە پەردەی بیرم کاڵ نەبووتەوە،

ئەوە بوو لەو یەک دوو ساڵەی دوای شۆڕشی چواردەی تەمووزی ١٩٥٨ دوورا و دوور «ئەو خوێندکاری قۆناغی سێیەم و چوارەمی بەشی عەرەبی کۆلیجی پـەروەردەی بەغدا بوو، منیش لە قۆناغی یەکەمی بەشی کیمیای هەمان کۆلیج بووم» چاوم پێی ئەکەوت و بەڕووخساریدا، وریا و چالاک و هەمیشە سەرقاڵ ئەهاتە بەرچاوم.

دوایی بۆم دەرکـەوت، کە قۆناغی یەکەم و دووەمـی لە بەشی عەرەبی کۆلیجی ئادابی شام خوێندەوە و پاش شۆڕشی چواردەی تەمووزی ١٩٥٨، گەڕاوەتەوە عێراق و لە سەرەتای پەنجاکاندا کە لە سلێمانییەوە بە مامۆستایی بە هۆی چالاکی و جموجوڵی سیاسییەوە گوازراوەتەوە بۆ قەڵادزێ و دواتریش بۆ سلێمانی و ئەوجا قەمچوخە، لەو سەردەمەدا فەرهەنگێکی عەرەبی کوردی دوو سێ هەزار زاراوەیـی بۆ قوتابیەکانی پۆلی چوارەم داناوە و لەپاڵ ئەوەشدا سەرگەرمی چالاکی و کاری سیاسیش بووە و وەک لەم دوو سێ ساڵەی دواییدا لەخۆییم بیست کۆمەڵێکی خەڵکەکەی بەلای لایەنەکەی خۆیدا ڕاکێشاوە.

بە باوەڕی من، کاک عیزەدین، ژیرانە سوودی لە هەموو قۆناغەکانی ژیانی وەرگرتووە، هەر لە خوێندنی حوجرە و قوتابخانەی «غـازی» ی سەرەتایی و نـاوەنـدی و کۆلیجی شەریعەی بەغدا و ئامادەیی و قۆناغی یەکەم و دووەمی بەشی عەرەبی کۆلیجی ئادابی شام و سێیەم و چوارەمی بەشی عەرەبی کۆلیجی پـەروەردەی بەغدا و دواتریش خوێندنی دکتۆرا لە ساڵی ١٩٦٢دا لەباکۆی یەکێتی سۆڤێت و دواجاریش لە ١٩٧٩دا چووەتەوە بۆ مۆسکۆ پلەی دکتۆرای ناوک و پرۆفیسۆری وەرگرتووە. جا تەنانەت، ئەگەر یەکەم کەس نەبووبێت، لەوانەی وەکو ئەو لە وڵاتی سۆڤێت خوێندویانە «و زۆربەیان تا ئێستایش دکتۆرانامەکەی خۆیان چاپ و بڵاونەکردۆتەوە بۆ سوود لێوەگرتنیان!» پێشەنگی ئەوانە بووە کە بەوپەڕی باوەڕ بەخۆکردن و دڵنیایی و شانازییەوە دکتۆرانامەکەی چاپ و بڵاوکردۆتەوە و سوودی لە خوێندنی حوجرە و بەشداریی ئامادەبوونی فەقێکانی مزگەوتەکەی حاجی مەلا ڕەسوڵی باپیری و باکی و کۆلیجی شەریعە و خوێندنی شام و بەغدا و هەوڵ و بەشداری و کاراتیاکردنێکی زیرەکانەی لە ڕۆژنامە عەرەبی و کوردییەکانیشدا، فارسی و عەرەبییەکی باش فێر بووە و دیارە هەر لەبەرئەو پەرۆش و هەتەرییەیشی زمانی ڕوسیش فێر بـووە و بەهۆی توند و تۆڵی و فراوانیی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی بە هەموانەوە و هەتەری و پەرۆشی فێربوونەوە شارەزاییەکی باشی لە هەموو شێوە -زارەکانی کوردیدا پەیدا کردووە و سوودی لە هەموو ئەو زمانانە وەرگرتووە لە نووسین و وەرگێڕانی کتێب لـەو زمانانەوە بۆ کـوردی و بەپێچەوانەیشەوە و هەر ئەوەیش بۆتە هۆی بەهێزی و فراوانی نائاسایی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی و دیسان سوود لێوەرگرتنی ئەو پێوەندییانەش لە بژار و مشت و ماڵ و کۆکردنەوە و ڕاهێنانی ئەو زمانانە و بەکارهێنانیان لە گەشە کردن و فراوانتربوونی ئاسۆی زانست و زانیارییەکانی لە نزیکەی هەموویان زۆربەی بوارەکانی زانست و زمانداو، بەڕاستی لەسەراپای ژیانیدا کە خەمخۆرانە بۆ ئەو ئامانجە تەرخانی کردبوو، تەنیا خاوەن بڕوانامەیەکی وشک و زڕو بێ بەرهەم نەبوو، بەڵکو هونەر کارێکی ژیر و هۆشیار و بەهرەمەند و داهێنەر و ئەدیب و مێژوونووس و نووسەرێکی بەبڕشت و شارەزا و فرە بەرهەم و بوێر و جوانکار و مرۆڤێک بوو لەگەڵ بۆچوون و هەستی خۆیدا ڕاستگۆ بوو، هەرچییەکی بەڕاست زانیبێ نووسیوێتی و ئەوەی بە بڕوای خۆی بە هەلی زانیبێ بەرگریی لێ کردووە و هەرچییەکیشی بەناهەق زانیبێ، بەرەنگاری بووەتەوە و ئازایانە بیروبۆچوونی خۆی لەبارەوە دەربڕیوە!

تێدا ژیان و بەشداریی لە بزاڤی نیشتمانی و نەتەوەیی گـەلـەکـەیـدا، تێگەیشتنی فـراوانـتـر کـرد و توانستی نەخشەکێشانی ژیان و ئامانجەکانی گەلی زیاتر پێ بەخشی و هێزێکی گەورەی بۆ ڕەنگرێژیی خەبات و ئایندەیەکی ڕوونـاک، دایـەو لە خەو و ئـاوات و ڕەشبینییەوە، بوو بە ڕاستی و دیمەنێکی ڕوون و ڕوخسار جوان، بۆیە لە هەموو بەرهەم و بۆچوونەکانیشیدا، کە بەردەبازی ڕێگەی ئەو ڕاستییە بـوون، شۆڕشگێڕانە و دووربینانە و زۆر فـراوان ئەیڕاوانییە جوانی و جیهان و دیرۆک و ژیان و بەرزیی شێوە و ناوەڕۆک لە نووسینەکانیدا لە ئاستێکی هونەری و ئەدەبی و ئێستاتیکی هەڵچودا یەکگیربوون و زمانێکی پاراوی کوردی و پتەو و ڕەوان و بەگوێ ئاشنای بەکارهێناوە و توانیویەتی زمان بکاتە بەشێکی گەورەی جوانی بەرهەم.!

لە هەموو ئەمانەیش گرنگتر ئەوەیە، لەسەر هەموو بوار و ڕووداو و بۆنە و بابەتەکانی ژیانی گەلەکەی دوواوە و نووسیوەو بـەشـداری لە نووسینی و ورد و درشتی بەسەرهات و مەینەتی و مەرگەساتەکانی نەتەوەکەی، نەک هەر لە باشووری کوردستان، بەڵکو لە بەشەکانی تریشدا، بە حوکمی لەگەڵ و تێدا ژیان و بەدوادا چوون و خولیای بە پێویست و بەهی خۆزانین و خۆتێ هەڵقورتانی ئەو بەسەرهاتانە و توند و تۆڵی و فراوانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی، کردییە ئاشنا و دۆستی زۆر کەسی نـاسـراو و هەمە جـۆر، بـەوەیـش بەشێکی گرنگی ئەو بەسەرهاتانەی لە شێواندن و لەناوچوون پاراست.

چیرۆک

# ئێمەش منداڵ بووین..

د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ



**پێشکەش بە ئازادی گەلاوێژ بێت ١٩٦٤**

بەپەلە پەل خۆم کرد بە ژوورا، نەمئەزانی دواکەوتووم، یا زوو، یا لەکاتی خۆیدا هاتووم. لەبیریشم نەبوو لەوەپێش لە یەکێک بپرسم کەوا دیارییەکانم بدەمە دەست ئازاد خۆی، یا لە شوێنێکا دایبنێم. پاڵتۆکەم هەڵواسی و بەپێی پێڕەوی خانەخوێکەم وا ڕاهاتبووم، کە گورج پێڵاوەکانم داکەنم و سۆلێکی ناو ماڵ بکەم بەسەر پێوە. شتەکانم هێشتا بەدەستەوە بوو، لە خەیاڵدا بووم و دانەنیشتبووم کە لەدەرگا درا.

یەکێک هاتە ژوورەوە، (براژنە) خانەخوێکەم ڕایچڵەکانم:

– ئەوا دایکیشم هات، ئەوە دایکمە، با بە یەکترتان بناسێنم.

منیش و پیرێژنیش پێکەوە دامانە قاقای پێکەنین، نەمهێشت بپرسن ئەم پێکەنینە چییەو سەریان سوڕبمێنێ منێک چەند ڕۆژێکە هاتوومە باکۆ، پیرێژن لەکوێ ئەناسم، بە هەلم زانی وا درێژە بدەم بە قسە، ڕەوشت نەزانینی دیاری پێشکەش کردن لەبیر خۆم و ئەوانیش بەرمەوە، ناسیاویی خۆم و پیرێژنم بۆ کردنە چیرۆک و دەستم کرد بە گێڕانەوەی، چونکە بە ڕاستی ئەو ئێوارەیە بە پێچەوانەی ڕۆژەکانی پێشووەوە، لە سەر کار من کەوتبوومە پەلە ئەمویست خێرا ئیشەکەم تەواو بکەم، لە کاری خۆم ببمەوە ئەوسا یارمەتی هاوەڵەکەم بدەم.

لەسەر مێزەکەی خۆم — لە ڕادیۆی باکۆ — ورتەم لەخۆم بڕی و دەستم دایە نووسینی پرۆگرامی ئەو ڕۆژە، باسی ئۆکتۆبەر و هێرش و ئاگر و سەرکەوتنم دەکرد، سەیر ئەوە بوو پەلە پەل کردن ڕایەڵی قسەی نەئەشێواندم. بەشە وەرگێڕانەکەی خۆشم تەواو کرد، بەڵام نەگبەتی لەوەدا بوو، ئەو ڕۆژە «یاوز» ڕۆژی قسەی بوو...

«یاوز» ئەو کابرا قەڵەوە، سوورفلە، دڵپاکە، زۆر ئازا و چالاک بوو لە ئیشا. لە هەمووان بەرهەمی

زیاتر بوو. سەیر ئەوە بوو زۆری ئەو بەرهەمەی بۆ پارە پەیداکردن بوو، خوا هەڵناگرێ، ڕەنگە هەر ئەوم وا دیبێ حەز بە پارە پەیداکردن بکات، بەڵام بەرچاوی کراوە بێت و خزمەتی خەڵک بکات و هەمیشە میوانداری بکات.

ئەو کاتێ. ئیشی ئەبوو لە هەزار تەل و هەزار باس قسەت بۆ بکردایە ئەتووت گوێزی بۆ ئەژمێری بە «ئم.. ئم» خۆی وا لێئەکرد ئاگای لێتە چی ئەڵێی، بەڵام من کە لە فێڵی گەیشتبووم، جاروبار هەر بۆ سەیر شتێکم لێ ئەپرسی کە هەموانی ئەخستە پێکەنین.

– ئەرێ، کاک «یاوز» لەبیرم چۆتەوە، لە ئێرانا ئازربایجانی چەندە و کورد و فارس چەندن؟

– ئم.. ئم..

– لەگەڵ تۆمە، وەڵامم بدەرەوە، چەندن؟

– ها، ها، گوێم لێتە بەخوا دڵم لەلاتە، چەندە، چەندن، ئەمڕۆ بگاتە ٢٥٠ دێر، شەش کەڕەت دوو سەدو پەنچا، ئەکاتە سەدو پەنچا ڕۆبڵ. جا کەر لەکوێ کەوتووەو کوندە لەکوێ دڕاوە؟ ئەمە ئەگەر ئیشیشی زۆر نەبوایە، بە باسی تەورێز و تاران و کاشانی و شەهریار و شیعری سەعدی و حافز ژوورەکەی ئەهێنایە جونبوش، کە شیعریشی دەخوێندەوە هەموو گیانی لەگەڵیا ئەجوولا. ئەو ڕۆژە، هەرچەندە کاری زۆر بوو، من وەک ڕۆژان یارمەتییەکی ئەوتۆم نەدا، بەڵام هەر بەرەو قسەکردن ڕام کێشا.

– ئەمڕۆ هەرچەندە خێراش بەجێت دەهێڵم، بەڵام پێم بڵێ — من فێری ئەم جۆرە تەنتەنەیە نیم. دیاریی منداڵ لەکوێ ئەفرۆشن؟

– چۆن گەورەم یارمەتیم نادەیت کارەکەم زوو تەواو بکەم؟

– ئەمڕۆ تۆش و کاری هەردووکیشمان بە پێکەنینێکی «ئازاد» ناگۆڕمەوە.

– بەڵام من.. ئیشەکەم! ئەمڕۆ دە دەقیقەم بە قسە کردن لەکیس دا..

– ئارەزوی خۆتە، من بۆیە ئەمڕۆ کاری خۆم پێش تۆ تەوا کرد.. «بەدەم قسەوە پاڵتۆکەمم لەبەرکرد، شەپقەکەمم گرت بەدەستەوە«.

– لەسەری مەڕۆ، ئەمڕۆ دواکەوەو خۆت ئیشی خۆت بکە، سبەینێ هەرچیت هەیە من بۆتی ئەکەم.

– گەورەم..

– پێم بڵێ دیاری بۆ منداڵ لەکوێ ئەفرۆشرێ؟ هەرچەندە ئەویش زۆری وت، ئەوانی تریش قسەی خۆیان تێدا کرد، بەڵام من گوێم نەدایە، هاتمەوە دەروە، باش بوو زوو «تاکسی»م دەست کەوت: بەدەم ڕێگەوە قسەکانی ئەوانم ئەوتەوە.

– بۆچ لە دوێنێوە قسەت نەکرد تا پێت بڵێین لەم شارەدا ڕۆژی دوو شەمووان دوکان و بازاڕی ئەو جۆرە شتانە نییە.

بەڵام من هەر سوور بووم لەسەر قسەی خۆم، نابێت کۆگای مەزنی شار «ئونیڤەرماگ» دوو شەموان نەبێت، لە هەموو شارێک هەر هەیە، بە ڕێگەوە ئاواتم ئەوەبوو کە قسەی من سەرکەوێ.

باش بوو، ئوتومبیلەکە زوو گەیاندمی، زۆر لە شەرمەزاری ئەترسام، نەک تەنیا بەرامبەر بەم ڕەسم و عادەتە تازەیە کە ئەبێ پیاو بەجێی بهێنێ. بەڵکو



بەرامبەر بە ئازاد، کە چۆن تەنیا من وا بەدەست بەتاڵی بچم بۆ پیرۆزبایی.. دەمێک بوو ئەم جۆرە هەستەم نەدیبوو، باش بوو ئۆتومبیلەکە زوو گەیاندمی.

– ئەرێ، ئەوە کۆگا کراوەتەوە. هەم قسەم ڕاست دەرچوو، هەم شەرمەزار نابم. بەڵام وا ئەمجارە جۆرە هەستێکیکە دایگرتم.

من فێری ئەم جۆرە دیاری هێنان و بردنە نیم، لە وڵاتی ئێمەدا لەناو ئێمەماناندا ئەمە نییە، ئەترسم شتێکی ئەوتۆ بەرم کە هەموو پێم پێبکەنن. هاتم تەلەفوون بکەم بۆ هاوەڵەکانی ڕادیۆ، بەڵام دیارە ئەوانیش هەر پێم پێئەکەنن، بۆچ لەوێ بەیادما نەهات؟. ئەوان پێم پێبکەنن باشترە لەوەی شەرمەزاری لای ئازاد بم... دەستم دایە تەلەفوونەکە، بەڵام گورج شتێک هات بە بیرما، ئەوە لە هەموو شت باشترە، نە کەسی ناسیاو پێم پێئەکنێ و نە شەرمەزاریش ئەبم. زۆر بەهێواشی لەو کچە جوانەوە نزیک بوومەوە کە دیاری و یاری و بووکە شووشەی ئەفرۆشت بە ڕاستی کچەکە جوان و خوێن گەرم بوو، خۆ چاوەکانی لەوانە بوو کە پێیان ئەڵێن چاوی ئاسک، باوەڕ بکە نموونەیەکی کچە جوانەکانی «باکۆ» بوو.. گەر.. گەر.. سمێڵی نەبوایە، ئاخ سمێڵ.. ڕوخساری نیوەی کچی باکۆی شێواندوە.

نزیک بوومەوە و بە شەرمەوە پرسیم:

– کچەکە! بۆ منداڵێ کە جەژنی چوارەمی لەدایک بوونی بێت، چی ئەبرێت بە دیاری؟

نەمزانی پێکەنینەکەی چی بوو، چ مانایەکی تیابوو، هەرچییەک بێت، پێکەنینی کچی جوان جوانە.

– کوڕ یا کچ؟

– کوڕ، کوڕ.

– هەر ئێستا بەدڵ و زەوقی خۆم چەند شتت بۆ کۆمەڵ دەکەم.

– هەی دڵ و زەوقت هەر خۆش بێت.

دیارییەکانی تەواو نەپێچابۆوە، لە تۆپ و ئۆتومبیل و گەلێ شت، کە پیرێژنێکی بەخۆوە هات لای منەوە وەستا و هەر بەو جۆرەی من پرسیارەکەی منی دووبارە کردەوە.

– کچەکە! بۆ منداڵێ کە جەژنی چوارەمی لەدایکبوونی بێت چی ئەبرێت بەدیاری؟

من و کچۆڵە بێ پەروا دەستمان کرد بە پێکەنین، پیرێژن سوور بۆوە، لەلایەک شەرم و لەلایەکەوە تووڕە بوو.

– بۆچ پێکەنین؟ باوکم جەژنی لەدایکبوونی بووە؟ دایکم، یا خۆم؟ هەر نەشم ئەزانی کەی دێین و کەی دەڕۆین و دەمرین.

باش بوو کچۆڵە، نەیهێشت پیرێژن بڕەنجێ، هەندێ باسی بۆ کرد. پیرێژن لای سەیر بوو کە من بەم لاوییە، تازە لە دەوری باوکی ئەوا بژیم. پڕ بەدەم و لە بەرخۆوە وتی:

– ژیانی تازە.. ژیانی تازە هەموو شتتان فێر ئەکات و ژیانتان تازە دەکاتەوە.

من ئەمەم هەمووی سەرلەنوێ گێڕایەوە، ئەوانیش هەر گوێم لێ ڕائەگرن، ئازادیش چاوەڕێی ئەکرد من لێ ببمەوە و پیرێژنیش بەشی خۆی لەم چیرۆکەدا بڵێ، ئازاد دیارییە پێچراوەکانی کردەوە و دەستی کرد بە ڕیزکردنیان، جاروباریش بەلایەکی گوێی شتێک لەوە ئەبیستێ کە من دەیگێڕمەوە. تا لە قسە بوومەوە و هەموو کەوتنە پێکەنین، ئەوسا هەموو گوێ و زمانی ئاڵاندە کۆڕی ئێمەوە و کەوتە پرسیار:

– ئەوە بەچی پێئەکەنن؟ بە منیش بڵێن. ئەوە مامم ئەڵێ چی؟

– هیچ، هیچ ناڵێ، چیرۆکی خۆی ئەگێڕێتەوە.

– چیرۆکی خۆی؟ من نەمبیستووە کوا؟ لەو کتێبی چیرۆکەدا نییە کە بۆم ئەخوێننەوە، ئێوە هەر چیرۆکی ورچ و کەروێشک و کۆترتان بۆ خوێندومەتەوە.

ئیتر تا نزیک خەوتن، خواردن و خواردنەوەی پێ ئەبڕیم و وڕکی ئەگرت، کە چیرۆکی خۆمی بۆ بگێڕمەوە، منیش هەر بێ دەنگم ئەکرد تا چووە سەر جێگە، ئەوسا چارم نەما، ئەمشە و لەجیاتی چیرۆکێکی ناو کتێبەکە، ئەبێ سەیری کتێبەکە بکەم من چیرۆکی خۆمی بۆ بگێڕمەوە. منێک بەم ڕووسییە شەق و شڕەی چەند مانگ تەمەنی، ئەبێ چۆن هەموو شت لە ئازاد بگەیێنم، پیاو کە لە وڵات دەربەدەر کرا، منداڵی فێری کوردی نابێت و ئەبێ لە زمانی کوردی بێ بەری بێت.

با ئەمەش لەولاوە بوەستێ. ئازاد تۆپە خنجیلانە تازەکەی هەر بە دەستەوە گرتووە، جاروباریش پێم ئەڵێ هەر ئەو تۆپەیان بۆ نەهێناوم بە دیاریی جەژنی لەدایکبوون، بەڵام ئەوەی تۆ لە هەمووان جوانترە، ها چاوت لەو هەموو ئۆتومبیل و بەلەم و تفەنگەیە،

عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ



ئەوە دیاریی تۆ و باوکم و دایکم و پوورم و نەنکمە، دراوسێکەشمان دیاریی بۆ هێناوم، بەڵام تۆپەکەی تۆ زۆر جوانە، ئازاد لەسەر جێگەکە تۆپەکەی گرتبووە باوەش و داواکردنی چیرۆکەکەی منی لەبیر نەچۆوە، بۆیە منیش لە باسی تـۆپـەوە دەستم پێ کـرد و ئەمجارە کەوتمە چیرۆکخوانی.. «ئازاد گوێ بگرە!. تۆپ لای منداڵ خۆشەویستە، بەتایبەتی گەر بەری ڕەنجی ڕۆژەهای خۆی و کۆمەڵە هاوەڵێکی بێت.
ئا لەو شاری سلێمانیی کوردستانە، ئێمەش تاقمە منداڵێک بووین، زۆرمان حەز لەیاری کردن ئەکرد، لە پەڕۆ تۆپمان دروست ئەکرد، تۆپی بێ هەڵبەزە، لە یەکێ لە کەلاوەکانی گەڕەکدا دنیامان ئەکرد بە تەپوتۆز و خۆمان لە خۆڵدا ئەگەوزان جلمان بە بەرەوە نەئەما، یا بە کۆمەڵێ خۆڵ و تەپۆتۆزەوە، یا بە لایەکی کراس هەڵتڵیشاوییەوە ئەگەڕاینەوە ماڵەوە، ئیتر بخۆ، چەپۆکی دایکە و هەڕەشەی باوکە، ئەوەش کە خوا دابـووی، ساوەر بوایە، یا نیسک ئەبوو بە زڵفنج، ئای نازانی ڕۆژێک لە هەفتەدا گەر برنجێک ببوایە چەند بە تاسەوە بۆی ئەچوومەوە و ئەو هەرای دایک و باوکەم چەند لا گران بوو، درۆشت لەگەڵدا نەکەم، دایک و باوکم لەو شەوەوەدا لا دوژمن بوو، کە نەیان ئەهێشت ئەو خواردنە تاسووقەم بە دڵەوە بنووسێ.
یاریی تۆپی پەڕۆ ئەوەندەی تۆپی لاستیک خۆش نەبوو، هەموو ڕۆژێک نەبوو لە کەلاوەکەدا تووشی هەرا بین لەگەڵ ئەم و ئەودا، یاخود یەکێ لە خەڵکی گەڕەک لە قیژە قیژمان وەڕس ئەبوو، یا ڕێبوارێک قوڕگی پڕ ئەبوو لەتۆز، یا جار نا تۆپێکیش بەر شانی ئەکەوت، ئیتر یاریی لێ تێک ئەداین و پەناگوێی لاسارترینمانی سـوور ئـەکـردەوە، ئاش بەتاڵی پێ لێئەکردین.
هەندێک لـە منداڵانی گـەڕەک ئەیانخوێند تۆپی مەکتەبیان دیبوو، خۆ هەمووشیان لەبەرچاومان بوو حەمەی قادر بەگ لەسەر گۆل باوکی دەوڵەمەند بوو لە بەغداوە تۆپی بۆ هێنابوو، ئەویش بە ئارەزووی خـۆی کێی بویستایە لە منداڵانی گـەڕەک یاریی لەسەر ئەکرد. ئێمەش ئەمەمان زۆر لاناخۆش بوو، ئەمانویست هەموو یاری بکەین، چەند جار شەڕمان لەگەڵ کرد، گەیاندمانە شەڕە گەڕەک، هەموو ئێمە لەگەڵ دەستەی یـاری کـەری هەڵبژێردراوی ئەودا شەڕمان ئەکرد، بەڵام دیمان سەر ئێشەیە. پیاوی گەورە ئەهاتە سەرمان ئەیان گەڕاینەوە گەڕەکەکەی خۆمان.
ڕۆژێک بەیەک دەنگ بڕیارماندا ئەبێ ئێمەش تۆپی خۆمان هەبێت، تۆپی هەموومان، تاقە کەس نا. بڕیارماندا ئەبێ چەند مانگێک نەچێتە سـەر، بە کۆمەڵ تۆپێک بکڕین، هەموو یاریی پێ بکەین و لە کـەلاوەکـەش نەمێنین، بچینە دەشتەکەی بەر سەرقەبران، لەوێ کەس یاریمان لێ تێک نادات.
تۆپەکەمان تۆپی هەمووان ئەبێت، هەژار و دەوڵەمەند یاریی پێ ئەکەن، بۆ ئەمەش «فەرەیدون» کە لە هەمووومان گەورەتر بوو، وریا و زرنگ بوو، لەناو منداڵی گەڕەکیشدا بە ئازا ناوی دەرکرد بوو، کرا بە سەرۆک. پارە لای ئەو کۆئەکرێتەوە و تۆپیش لای ئەو ئەبێت و کاری یاری و دەستە ڕێکخستنی یاریش لە دەست ئەودا ئەبێت. ئەویش هەر یەکسەر کاغەز



عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ





و قڵەمێکی گرت بە دەستەوە و دەستی کرد بە ناو نووسین، بە حساب خۆی کوڕە دەوڵەمەندمانە، چونکە باوکی دوکانێکی ڕێک وپێکی هەبوو، لە هەمومان پۆشتە و پەرداختر بوو، ڕۆژێ چەند فلسێکی لە ئێمە زیاتر وەرئەگرت بۆ خەرجیی ڕۆژانە. بەڵام خۆشی و ترشی ئەو لەگەڵ ئێمەدا بوو، نە ئەوسا نە ئێستاش بە گەورەیی خۆی لە کۆڕی ئێمە جیا — نەکردۆتەوە. کە دەستیشی دایە قەڵەمەکەی یەکسەر ناوی خۆی نووسی و سێ فلسیشی لە تەنیشت ناوەکەیەوە نووسی. حەسەنی دراوسێمان، بەیانی تا ئێوارە شاگرد چایچی بوو، بەناو بازاڕ ئەسووڕایەوە پیاڵەی چای بەتاڵی کۆ ئەکردەوە، ئەویش گورج وتی: منیش ئیتر نیوەڕوان نایەمەوە ماڵەوە لە بازاڕ ئیش — ئەکەم، منیش سێ فلس..

هەریەکە یا خۆی شتێکی ئەگووت یا فەرەیدوون سەری ئەقەبڵاند، من باوکم ڕۆژی سێ فلسی ئەدامێ، ڕۆژی فلسێکم لەسەر کرا بە ماڵ، فلسێک زۆر بوو، ماجوومییەک یا مەسکەتێکی شیرینی ئەکرد، چنگێ گەنمەشامیشی پی ئەکڕدرا، بەڵام یاری و فتبۆڵیش خۆشە، گەر پیاو بە ئارەزووی خۆی یاری بکات.

هەندێ ڕۆژ مەلا کوێرەکەی محەلەبی فرۆش بە بەر دەرگاکەماندا ئەڕۆیشت، هەر سێ فلسەکەم ئەدایە و قاپێ محەلەبیم ئەخوارد، وا ئێستا ئەویش نەما، بە دوو فلس تیا نابێت.

سندووقی پارەکەمان تا ئەهات پڕ ئەبوو، لە خۆمان بەولاوە کەسی تریش نابێ بەم کەین و بەینە بزانێت. نە باوک، نە دایک، نە برای گەورە، نەوەک لێمان تێک بدەن.

من ئەوسا لە حسابدا زیرەک بووم، ڕۆژێک فەرەیدوون پرسی، ئەوە چەند مانگ ڕابورد، ئا لێکی بدەرەوە، ئەبێ ئێستا چەند پارەمان لە سنووقا هەبێت؟

گورج وەک دانی مار لێکم دایەوە، چەند دینارێکمان هەبوو، فەرەیدوون لەپێشەوە بڕیاریدا خۆی بچێ تۆپەکە بکڕێ، دوایی ڕێک کەوتین کە دەستەیەک ڕێک بخەین و زۆر بە هەڵلا و بەزمەوە بچین بۆ کڕینی. سبەی ئێوارە هەموو کۆبووینەوە، لەخۆشی ئەوەی چاومان بە تۆپ کەوتبوو، هەموو ئەفڕین، هەندێکمان چاومان ،پڕ بوو لە ئاو، لە سبەینێوە هەم بە تۆپی هەوا یاری ئەکەین، هەم یەک قاپ، قاپێکی بچووک محەلەبی ئەخۆم، ئەتوانم سبەینێ چوار فلس لە باوکم بسێنم، لەو قاپانە بخۆم کە دارچینی و بادەمی بەسەرەوەیە. پارەکەمان زۆر بوو، تۆپ و هەرچی پێویستی ئامادە کردن و پاراستنی تۆپ هەیە هەموویمان بۆ کڕی، کۆمیتەی تۆپ پاراستن و «با» تێکردن و دەستەی پاک کردنەوەی دەشتی سەرقەبران لە بەرد و دڕک و داڵ هەڵبژێردرا.

ئەو ئێوارەیە، خۆشیی وامان نەدیبوو، تا دنیا تاریک بوو، ئیتر چاومان یەکتری نە ئەبینی یاریمان کرد، ئەوسا تۆپەکەمان خستەوە سەر دڵمان و هاتینەوە ڕووەو شار.

هاتمەوە ماڵەوە، ترسم لێ نیشتبوو، ئەمووت، ئێستا باوکم لەودیوو دەرگاکەوە وەستاوە و زرمە لە پەنا گوێم هەڵئەسێنێ.

بەڵام باوکم دیار نەبوو..

ئێمەمانان ئازار زۆر ئەچێژین، ژیانمان ناخۆشی و



ئازاره، بۆیه خۆشی له ژیانماندا گەر جارێک بێت، دیاره و لەبیر ناچێتەوە. با لێدانی ئەو ڕۆژەش لەسەر ڕۆژان بێت، بەڵام خۆشی ئەو تۆپەم لەبیر ناچێتەوە. وا دیاربوو، ئەو ڕۆژە من بەختم له هەموو منداڵی گەڕەک سوارتر بوو، مریشکمان هەبوو، مریشک.. ساڵێک بوو مریشکه ڕەشه له حەوشەدا ئەسووڕایەوە، ئەو ڕۆژه باوکم فرمانی سەربڕینی دەرکرد بوو، هەر له دەرگاوه بۆنی برنج و مریشکم کرد، بڕیارمدا چەندم لێ بدرێ نەگریم، بەڵام خوا و ڕاستان، پێ و قەدەمی مریشک خێر بوو، ڕەنگه ئەو ڕۆژه یەکەم جار بێت باوکم گوێ بۆ قسەی ژن ڕاگرێت، هەر له دەرگاوه گوێم له هاواری دایکم بوو.

- بیکه به خاتری خوا، لێی مەدە، ساڵی جارێک مریشک ئەخوات با به دڵییەوه بنووسێت. ماندوو بووم، زۆرم ڕاکردبوو، هەڵبەزیبوومەوە، تا توانیم خواردم، دایکیشم هەر ئەیوت:

-مەنجەڵەکه پڕه بخۆ به بەزو پاڵێنجەی ناو شانت بێت.

سبەینێ فەرەیدوون بڕیارنامەی پاراستنی تۆپی گەڕەکی دەکرد.

«هەموو ڕۆژ یاریی پێ ناکرێ، ئەبێ بەشی یاریی ساڵێ، دووانمان بکات، جاروبار منداڵی گەڕەکی تریش ئەتوانن بێن یاریمان لەگەڵدا بکەن».

سەرت نەیەشێنم ئازاد، سێ جار یاریم بەتۆپ کرد. ئێوارەیەک هاتمەوە، باوکم له درەنگ هاتنەوەم وەڕس بوو بوو. لێدانی زۆری ئێواران ماندووی کرد بوو... دەمێک بوو ئەیاڕامەوە، بمنێرێ بۆ چوارتا بۆلای مامم، ئەوسا ئەو پەڕی خەیاڵم چوونی بەغدا بوو، ئەوپەڕی توانای گەشتم ئەودیو ئەزمەڕ، لای چوارتا بوو، نەمئەزانی ڕۆژێک ئەبێ ڕێگەی مۆسکۆ و باکۆ و بەرلین و وارشاو و پراگ ئەکەم به ڕێگەی کانی. باوکم ئەو ئێوارەیه بڕیاریدا لەگەڵ خوله قازیی کاروانچیدا سبەینێ بمنێرێته چوارتا، تا بەیانی زەنگی ئێستری کاروانچی ڕاییەڕاندم و سواری ئێستر بووم، هەر لێکم ئەدایەوە.

هەرچەنده چیاو ئاو و سەرداری پیراڵکیش له چوارتا زۆر خۆش بوو، بەڵام دڵم لای تۆپەکه بوو، به ڕەنجی شان پەیدامان کردبوو. هاتم بۆ یەکەمجار نامەم نووسی، له پۆلی چوارەم بووم، خوێندن و نووسینم ئەزانی، باوکم بۆچ نامه ئەنووسێ، با منیش دەست بدەمه قەڵەم.

شتێکم نووسی: «سەلام له فەرەیدون ئەکەم، تۆپەکەمان چۆنه؟ هەواڵی خۆتانم بۆ بنووسن. چوارتا زۆر خۆشه، حەز ئەکەم یا ئێوه لێره بوونایە، یا من بێمەوە بۆ لاتان.. حەمە عەلی

نامەکەم لەناو منداڵی گەڕەکدا دەنگی دابۆوە، یەکێکمان لێ فێری نامه نووسین بووە، له پۆلی چوارەمە و نامه ئەنووسێ، به هەموویان دانیشتبوونەوەو ئەم نامەیەیان بۆ نووسیبووم:

«چیت بۆ بنووسین؟.. هەموومان قوڕگمان پڕ بووە له گریان، ئێواران درەنگ ئەگەڕاینەوە ماڵەوە، باوکی فەرەیدون هات، هات، چەقۆیەکی دەرهێنا به هەموو هێزی خۆی هەڵیکێشا، دڕانی، تۆپەکەی دڕاند و فڕێی دایه ناو شیوەکەوە، ئاو بردی، هەموومان سەلامت لێ ئەکەین بێ تۆپ نازانین چی بکەین، له سبەینێوە دەست ئەکەینەوە به پاره کۆکردنەوە، ئەمجاره به نۆره یەکێکمان لای شیوەکه ئەوەستین، هەر باوکی فەرەیدوون هات پێمان بڵێ له گومەزەکەدا تۆپەکه بشارینەوە».

ئازاد هێشتا خەوی لێ نەکەوتبوو، تۆپەکەی گرت بەسەر دڵیەوە، موچڕکێکی پیادا هات و لەبەرخۆیەوە هاواری کرد.

-کوردستان!! له کوردستان به چەقۆ تۆپ ئەدڕێنن؟ له دەموچاویدا دیار بوو که هەرچی دیمەنی جوانی کوردستان هەیه و باوکی له مێشکیا دروستی کردوە و هەموو ڕۆژێ باسی جوانی و ئاو و شاخ و بەفری وڵات. هەموو ڕۆژێ پرسیاری «کەی دەچینەوە کوردستان؟» هەمووی فڕی و له مێشکیا بووه شتێکی سەیر. خەریک بوو چاوی ئەنایه سەریەک که من ئەمویست ئەو وێنه جوانەی کوردستانی بهێنمەوە بەرچاو و نەیەڵم بیری بەلای دیکەدا بچێت.

نا، ئازاد، بنوو.. کوردستان زۆر جوانە، تا تۆ و باوکت دێنەوە، ئەوسا لەکوردستان باوک تۆپی کوڕی نادڕێنێ، باوک تۆپ بۆ کوڕی ئەکڕێ..

هەموو باوکێک.. بنوو..

**له باکۆ له (ت٢)ی ١٩٦٠دا دەستم پێ کرد. له شوباتی ١٩٦٤دا تەواو بوو..**

# مێژووی ئەدەبی کوردییەکەی (د. عیزەدین) و هەندێ سەرنج و بەراوردێکی کورت



کاروان عوسمان خەیات (ڕێبین)

پێچەوانەی ئەوانەی کە هەندێک جار لە نووسین و گفتوگۆ و چاوپێکەوتنەکاندا دەڵێن: لە مێژە من خەریکی ئەو کارەم، یان دەستم بەو کارە کردووە، من دەڵێم: ئەمە چەند جارە لەگەڵ هەر یەک لە مامۆستا موحەممەد عەلی قەرەداغی و کاک ساڵەح هەلاج و چەند کەسێکی دیکە، لە نووسیندا باسی ئەوەم کردووە کە ئێمەی کورد مێژوویەکی ئەدەبی کوردیی ئەوەمان نییە بتوانین وەکو سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراو و بێ هەڵە و کەموکورتی بێت، لە نووسین و گەڕان و پشکنیندا بەکاری بهێنین و سوودی تەواوی لێ وەربگرین، لەوانەشە هەندێک لە نووسەران و ڕووناکبیران و لێکۆڵەرانی ڕێبازی شیعری لەگەڵ ئەم بۆچوون و قسەیەی مندا هاوڕا و هاوتەبابن.

دوای بڵاوبوونەوەی ڕۆڤاری (سالم) لە ژمارەی پێشوودا، لەگەڵ هاوڕێی خۆشەویستم کاک (کامەران سوبحان)دا باسی ژمارەی دواتر و بەردەوام بوونی ئەم گۆڤارەمان کرد، بیرۆکەی ئەوەم بۆ دروست بوو کە پرۆفیسۆر عیزەدین مستەفا ڕەسوولیش پرۆژەی نووسینەوەی مێژووی ئەدەبی کوردی لەستۆگەی خۆی ناوە و بەرگێکی لێ بەچاپ گەیاندووە.

واشم بەباش زانی بەپێی ئەو ماوەیە کە لە بەردەستدایە،

خوێندنەوەیەکی کورتی لەبارەوە بنووسم، بەپێی ئەو ماوە و کاتەی کە لە بەردەستدایە، هەرچی سەرنج و تێبینی بەندە هەیە لەو بارەوە، چ سەرنجی تایبەتی خۆم هەیە، چ ئەو سەرنجانەی کە لە مێژووی ئەدەبیاتی فارسی و گەڕان و پشکنینەکانی خۆمدا بەناو ئەو سەرچاوانەی کە لە بەردەستمدایە، بیانخەمە ڕوو... بەڵکو دکتۆر لە دوای لێکدانەوە و تاوتوێ کردنی قسە و باسەکان لێکیان بداتەوە و لە بەرگەکانی دیکەدا جێبەجێیان بکات.

وەکو ئەوەی وتراوە پێشەکی هەر کتێبێک خستنەڕووی ڕێباز و کۆنووس و ناوەڕۆکی ئەو کتێبەیە کە نووسەر نووسیویەتی، وتراویشە هیچ نووسینێک بێ کەموکورتی نییە، بەڵام وردبوونەوە و گەڕان و پشکنین، مرۆڤ لە هەڵە و کەموکورتی دەپارێزێت.

نووسەری کتێبی مێژووی ئەدەبی کوردی کە پرۆفیسۆر. دکتۆر. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵە، ئەم کتێبە تاکو ئێستا بەرگی یەکەمی چاپ کراوە، هەر لە سەرەتاوە هەندێ لە هەڵە و کەموکورتییەکانی دیارن و هەندێ سەرچاوەش هەن کە زۆرن لە نێو کتێبخانە و بازاڕدا، یان ئەوەتا نەیبینیون یان ئەوەتا خۆی لێ بواردوون و کەڵکی لێ وەرنەگرتوون. خوێندنەوەی ئەم کتێبە و نووسینی ئەم بابەتە تەنها قسەکردنە لە سەر پێشەکی کتێبی مێژووی ئەدەبی کوردی دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ.

نووسەری ئەم کتێبە هەر لە سەرەتاوە دەڵێت: «ڕەنگە دە ساڵ زیاتر بێت خۆم بۆ نووسینی مێژووی ئەدەبی کوردی ئامادە دەکەم. خۆ ئامادەکردن بۆ پرۆژەیەکی وا زیاد لە شارەزابوونی ئەدەبیاتی کوردی خۆی لە کۆمەڵێ ئیشی دەوێ. بێگومان بۆ لاسایی نا، بەڵکو بۆ فێربوونی ڕێبازی زانایانی وڵاتانی تر و بەرنامە و ڕێبازی هاوچەرخ لەلای ئەوان و ئەوسا کۆکردنەوەی سەرچاوەی لای خۆمان و نموونە نووسینەوە لەسەر کارت (پێش پەیدابوونی کۆمپیوتەر) پلەیەکە لە کارەکەدا و ئەوسا دەستدانە نووسین».




وەکو دەبینین نووسەر لە سەرەتای پێشەکی کتێبەکەیدا ئەوەمان بۆ دەخاتە ڕوو کە نزیکەی ١٠ ساڵە کار لە سەر ئەم پرۆژەیە دەکات و بۆ لاسایی نەکردنەوە لەکاری وڵاتانی تر و ناوخۆییشدا ڕێبازێکی تایبەتی بۆ خۆی دروستکردووە و وای کردووە کە لاسایی وڵاتانی تری نەکاتەوە... هەروەها کارکردنیش لە سەر هەر ئیش و کارێک پێشوەخت دەبێ یان لە سەر کاغەز بنووسرێت، یا دەبێ لە کۆمپیوتەردا بنووسرێتەوە، ئیدی داهێنان و بەرنامە ڕێزی لەم کارەدا لەچیدا دەبینرێت کە نووسین لە سەر کاغەز یان کارت نەبێت، ئاخۆ دەبێ زانایانی پێش ئێمە کە کۆمپیوتەر و تەکنەلۆژیایان لە بەردەستدا نەبووە، نووسینیان لە سەر چی کردبێت، پێستە و ... هتد.

هەروەها دکتۆر لە پەرەگرافی دووەمدا ئاماژە بە نووسینی مێژووی ئەدەبی کوردی ساڵەکانی پێشوو دەکات و دەڵێت: «پێش مامۆستا عەلائەدین سوجادی (کە لە زۆر ڕشتەی کوردی نووسیندا سەرئامەد بوو) چەند کتێبی ترمان هەبوون کە هەریەکە چمکێکی

مێژووی ئەدەبیان گرتبوو یا لە چمکێکیانەوە دەرچوونەوە سەر مێژووی ئەدەبی کوردی لەوانە «ئەنجومەنی ئەدەبیاتی کـورد»ی، ئەمین فەیزی و «گوڵدەستەی شوعەرای هاوعەسرم» و پاشان «شاعیرانی ناو ونبووی کورد»ی عەلی کەمال باپیر و دوو بەرگە بەنرخەکەی «شیعر و ئەدەبیاتی کوردی»ی ڕەفیق حیلمی کە مەیدانی مێژووی ئەدەب و ڕەخنەی ئەدەبی دەگرنەوە. ئەوسا «مێژووی ئەدەبی کوردی»ی مامۆستا عەلائەدین سوجادی کە خۆی بە گەورەترین ئینسکلۆپیدیای کوردیی وەسفکردووە...».

پێم وایە دکتۆر دوابەدوای ئەو کتێبانە چاوی بە کتێبی مێژووی ئەدەبی کوردی دکتۆر مارف خەزنەدار (٧ بەرگ) و مێژووی وێژەی کوردی دکتۆر سدیق سەفی زادە (٣ بەرگ) و مێژووی ناودارانی کوردی بابا مەردۆخ ڕۆحانی (٢ بەرگ) و مێژووی زانایانی کوردی مامۆستا مەلا تاهیری مەلا عەبدوڵڵای بەحرکەیی (٣ بەرگ)، ئەمانە خۆی لە خۆیدا توحفەیەکی تری مێژووی ئەدەبی کوردین، ئەڵبەتە هەر یەکەیان جیاوازی لەگەڵ ئەوی تریدا هەیە، هەریەکەشیان ڕێبازێکی جیاوازی گرتۆبەر، بەڵام خۆ دەکرێ باسیان بکرێت لەگەڵ ئەوانی تردا، چونکە ئەمانیش هیچیان کەم نییە لەچاو ئەوانی تردا، هەروەها بگرە ئەمان لە ڕووی قەبارە و ناوەڕۆک و باس و خواسەوە لەوانی تری جیاواز و گەورە و ڕێبازی ئەملاولای تری تێکەڵ کراوە، بۆ ئەم ڕێبازانەش پشتگوێ بخرێت و باسیان نەکرێت لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا.

جگە لەوانەی کە باسم کردن، ئەم چەند کتێبەش پێموایە خۆیان لە خانەی مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا دەگرنەوە و دەچنە ئەو خانەیەوە:

١- یادی شاعیرانی کورد: دانراوی هۆنراوەییە و لەلایەن حاجی شێخ حامیدی حیسامییەوە دانـراوە، ئەم کتێبە بەشیعر یادی شاعیران کراوەتەوە و ناوی شاعیرانی کۆن و نوێی کوردی تێدا هاتووە، لەم ڕێگەیەوە دەتوانرێت ناو و نازناو و شیعر و بەرهەمی ئەو شاعیرانەش بزانرێت و کنە و پشکنین بەشوێن بەرهەمەکانیاندا بکرێت.

٢- هەڵەبجە لە ئامێزی مێژوودا: ئەم کتێبەش باس لە ژیان و شیعری شاعیرانی هەڵەبجە دەکات، لە کۆن و نوێدا، دوو بەرگە و مامۆستا حەکیم مەلا ساڵح دایناوە.

٣- سورد بادیية (در احوال آثار شعراي کُرد و لك و لُر): ئەم دانراوەش لە لایەن مامۆستا مەلا موحێدینی ساڵحییەوە دانـراوە، ئەڵبەتە باسی ژیان و بەرهەمی ئەو شاعیرانە دەکـات کە خـۆی لە دەستنووس و بەیاز و نووسراوە کۆنەکاندا نووسراون نووسیویەتییەوە، جگە لەوەش باسی هەندێ شاعیری هێناوە کە لە مێژووی ئەدەبیاتی کورددا گومناون و تاکو ئێستا لە مێژووی شیعر و شاعیرانی کورددا باسیان نییە، یان ئەگەر باسیشیان بووبێت، ئەوا بەرهەمی کەمیان هاتووە، لێرەدا هەندێ بەرهەمی دیکەیان بڵاو کراوەتەوە.

٤- شاعیران کورد پارسی گویی: ئەم کتێبە بەڕاستی جێی لێکۆڵینەوە و قسە و باسە، لە دانراوی مامۆستا سەیید عەبدولحەمیدی حیرەت سەجادییە، باس لەو شاعیرانە دەکات کە شیعریان بە فارسی نووسیوە، ئەڵبەتە هەندێ شاعیرمان هەیە شیعری بە چەند زمان نووسیوە، هەشمانە تەنها بە عەرەبی یان بە فارسی یان بە تورکی نووسیوە، لێرەدا باسی لەو شاعیرانە کردووە کە شیعریان بەفارسی هەیە، ئەم کتێبەش کورتەیەک لە ژیان و چەند نموونەیەکی شیعری هێناوەتەوە.

٥- گـوڵـزاری شاعیرانی کـورد: لـە گـردکـۆی بـێـداری شارەزوورییە و مشتێکە لە خـەرواری شاعیرانی کورد، کورتەیەک لە ژیانی شاعیر و شیعرییان هاتووە....

٦- حەدیقەی سوڵتانی: نووسینی (میزرا عەبدوڵڵای سنەیی) یە و مامۆستا موحەممەد ئەمین کاردۆخی لێکۆڵینەوەی لە سەر ئەنجام داوە و کردوویەتی بەکوردی.

٧- شتێ لە ئەدەب و ژیان: عومەر عەزیز مەحوی، دوو بەرگە و باس لە ژیان ئەدەبی شاعیران دەکات، کۆمەڵە وتار و بابەتێکە لە گۆڤار و ڕۆژنامە کۆنەکانی ساڵانی پێشوو بڵاوکراوەتەوە، دووبارە کۆکراونەتەوە و بۆ نووسینەوەی مـێـژووی ئەدەبیاتی کـوردی کەڵکی لێ وەردەگیرێت، پێشموایە ئەمەش لە خانەی مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا جێگەی خۆی داگیر دەکات، چونکە ئەمیش بەچەشنێک لە چەشنەکان باسی لە ژیان و بەرهەمی شاعیران کردووە.

٨- مێژووی شیعر و شاعیرانی گەرمیان: ساڵەح هەلاج، ئەڵبەتە هەندێ ناوچەی تر هەن کە ئەم کارەیان کردووە، جگە لەوەش کتێبێک لەبارەی یارسانەکانەوە هەیە، کە شاعیرە یارسانەکانی لەخۆ گرتووە... ئەمانە و دەیانی تری هەن....

لە کۆی ئەو چەند کتێبەی دەستی من کەوتووە و سەرنجم داون، پێم وایە ئەمانە کە لەخانەی مێژووی ئەدەبیاتدا جێگەیان دەبێتەوە، پێویستە ناویان لەگەڵ ناوی ئەو چەند کتێبەی پێشوودا بهێنرێت کە دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ لە پێشەکی کتێبەکەیدا هێناویەتی و بە مێژووی ئەدەبیاتی کوردی لە قەڵەمیان دەدات. دەبێ بپرسین ئاخۆ ئەگەر ئەوانەی کەمالی بچنە قاڵبی مێژووی ئەدەبیاتی کـوردیـیـەوە، دەبـێ ئەمانە لە چی قاڵب و ڕەفەیەکی کتێبخانەی کوردیدا جێگەیان ببێتەوە؟!

ئەگەر لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا ئەژماریان نەکەین،

عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ



ئەوا دەبێ بپرسین ئەوانەی دکتۆر ناوی هێناون لە چی ڕەفەیەکی کتێبخانەی کوردیدا جێگەیان دەکاتەوە؟!
لە کوێوە دەست پێ بکەین؟
«لەمەوبەر هەر لە کتێبی «ڕیالیزم لە ئەدەبیاتی کوردی» دا باسی ئەم مەسەلەیەمان کردووە و لای زۆر لە تێکست و ناوی کۆن وەستاوین و موناقەشەی بوون و نەبوونیانمان کردووە، هەندێ لێکۆڵەرەوەش لای ئەم ناو و تێکستانە وەستاون و جاروبار ناویان ناون «تێکستە درۆکان» یا ساختە و دروستکراوەکان»...
«پێش بابەتایەر و مەلای پەرێشان، شیعر و شاعیرمان بووە، ڕەنگە زۆریان ونبووبن و نەمابن...».
ئەم چەند وتەیەی دکتۆر دەمانباتەوە بۆ لای هەندێ قسە و باس کە دەبێ جەخت لە سەر ئەوە بکەینەوە ئەگەر بێت و نووسینەوەی مێژووی ئەدەبیاتی کوردی بە تەنها کەسێک بکرێت لە کوردستاندا ئەستەمە، چونکە تەنها یەک ڕێگە و یەک پرۆگرام بۆ جێبەجێ کردن و نووسینەوەی مێژووی ئەدەبیات بەرەو هەڵەی گەورە و نابەجێمان دەبات، بۆ نموونە: ئێمە لە مێژووی شیعر و شاعیریماندا ئەگەر لە بابا تاهیری عوریانەوە دەست پێ بکەین، ئەوا مێژووی ئێمە زۆر کورتە و دەبێ بگرین بۆ مێژووی ئەدەبیاتی خۆمان، لە ڕاستیدا ئێمە دەیان شاعیری ترمان پێش بابا تاهیر هەیە، دەبێ لە هەندێ جێگەدا پشت بە دەستنووسی یارسانەکان و هەروەها مێژووی وێژەی سدیق سەفی زادەش ببەستین و بەکاری بهێنین، چونکە بەڕێزیان هەندێ لەو شیعرانەیان بڵاوکردووەتەوە کە پێش بابا تاهیر شاعیر بوون و شیعریان نووسراون.
ئەگەر ئێمەی کورد ئەو شیعرانە بەدرۆ و ساختە بزانین، دەبێ ناحەزانی کورد شیعرەکانی ترمان بەچی بزانن، وەکو ئەوەی بابا تاهیر کراوە بە فارس و نیزامی گەنجەوی فارس بەلای خۆیدا ڕایدەکێشیت و ... هتد.
ئەگەرچی نووسەر لە درێـژەی قسەکانی دا هێشتا لەو بڕوایەدا نییە کە ئەو شیعرانە بە تەواوەتی ساغ کرابێتەوە و هیوای وایە لە ڕۆژان و دەرفەتێکی تریدا ساغ بکرێنەوە و دەڵێت: «چونکە موناقەشە و بەدواداگەڕانمان لەبارەی ئەم پلەیەوە ماوە، لەبەر ئەمە هەڵیدەگرین بۆ دەرفەتێکیتر و لێرەدا لەم تازە نووسینەوەیەی مێژووی ئەدەبیاتی کوردی سەرناوێک بۆ ئەم پلەیە دادەنێین و چەند لاپەڕەیەکی بەتاڵی بۆ گەڕانەوە سەر بۆ بەجێ دێڵێین و لاپەڕە بۆ باس و سەردەمێکی تر هەڵدەدەینەوە».
بڕوای من لەم بارەوە ئەوەیە ئەگەر دکتۆریش لەم بوارە خۆی دەرباز بکات وەکو دکتۆر مارف خەزنەدار و ئاوڕ لەو باسە نەداتەوە، ئەم مێژووی ئەدەبیاتەش دووبارکردنەوەی هەمان ڕێبازی مارف خەزنەدارە بە گۆڕانێکی کەمەوە.
چونکە ناکرێت ئەم بێت و مێژوویەک بنووسێتەوە بڵێت: ئەمە جێدێڵم بۆ کاتێکی تر، ئەگەر من بۆ کاتێکی تر هەڵیبگرم و ئەویش بۆ کاتێکی تر و یەکێکی تریش بۆ سەردەمێکی تر، دەبێ بپرسین کێ خاوەنی ئەوەیە، کێ خۆی ئەدا لەو باسە، کێ پرۆژەی نووسینەوەی مێژوویەکی ئەدەبی کوردی پوختی پێیە و دەینووسێت یان نووسیویەتی....
یان لە جێگەیەکی دیکەدا دکتۆر دەفەرموێ: «هەر لە مەیدانی مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا چەند بەرگ بۆ بابەتە ئەدەبیاتێک تەرخان دەکرێت، کە تائێستا باری سەرنجی زانا و نووسەرانی کوردی بەتەمای چەسپاندنی لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا ڕانەکێشاوە، کە ئەویش ئەو ئەدەبیاتەیە کەوا بە زمانی تر نووسراوە.
چۆن؟ یا کام ئەدەبیات؟
ئێمەی کـورد، مێژوومان چەشنە ڕێڕەوێکی هەیە کە وایکردووە لە زۆر سەردەمدا شاعیر و نووسەری کورد بەزمانی تر لە سەردەمی دەوڵەتی یەکگرتووی موسوڵماندا واتە لە سەردەمی ئەمەوی و عەبباسیدا بنووسن.».
ئەگەر تەماشای ئەم وتەیەی دکتۆر بکەین لە پێش ئەوەی دکتۆر دەست بدات بەم کارەوە هەندێ کەس دەستیان بۆ ئەم کارە بـردووە، لەوانە شاعیرانی کورد پارسی گویی و مامۆستا بابا مـەردۆخ و... بـەڵام ئـەوان بەجۆرێکی دیکە لایان لەو شاعیرانە کـردووە، ئێمە شاعیری وەک خانامان هەیە کە بەزمانی فارسی شتی هەیە تاکو ئێستا بڵاونەکراوەتەوە، تاکو بەندە لە دیوانی خانادا بڵاوی کردەوە، هەروەها بەزمانی عەرەبیش شیعری هەیە، ئەگەر تەماشای خانا بکەین: خانای قوبادی وەرگێرانی لە زمانی فارسییەوە هەیە، شیعری فارسی هەیە، شیعری عەرەبی هەیە، شیعری کوردی هەیە... ئەڵبەتە شاعیریشمان هەیە تەنها بە فارسی یان بە تورکی یان بە عەرەبی نووسیویەتی، یان شتی بەکوردی هەیە و تاکو ئێستا دەرنەکەوتووە، بۆ نموونە: تاکو ئێستا شێخ عەبدولڕەحمانی خاڵسی تاڵەبانی شیعری بە کوردی دەرنەکەوتووە، بەڵام شیعرە کوردییەکانی لەلای بەندە هەیە و ئەوەی ساغ کردووەتەوە کە خاڵس شیعری بە کوردیش هەیە.
لە درێژەی قسەکانی دکتۆردا تووشی شۆک هاتم کە دکتۆر دەڵێت: «ئایا ئەم چەشنە بەرهەمە دەچنە ناو مێژووی ئەدەبیاتی کوردییەوە یان نا؟ وا ئەزانم لێرەدا لە زۆر شوێن و مەیدانی تر زیاتر پێویستمان بە تەماشاکردنی تەجروبەی گەلانی تر هەیە».
ئەگەر ئێمە خۆمان لەوەدا بچووک بکەینەوە ئێمەی کورد تەنها لە زمانی کوردیدا باڵا دەست بووین و مێژوومان

لەوەدا گرێ بدەین کە کورد تەنها شیعرە کوردییەکانی لەناو مێژووی ئەدەبیاتەکەیدا جێگەی دەبێتەوە، ئەوا دەبێ نالی چ شانازییەک بەخۆیەوە بکات کە بە سێ جۆر زمان شیعری هەیە، ئەگەر نالییەک ئەوەندە داهێنەر و شارەزا و لێزان و... هتد بێت، تۆ بڵێی هەر لەخۆ و بێ بنەما و سەلیقە شیعری بەسێ زمان نووسیبێ.. ئایا نالی و خانا و موخلیس و چەندانی دیکە کە بەو شێوە بیریان لە زمان و مێژووی گەلی کورد کردووەتەوە و ئەوەنە ئاوەزیان نەبووە ئەگەر مێژووی ئەدەبیاتی گەلی کورد دەبێ تەنها بە کوردی بۆی بنووسی یان دەبێ مێژووی ئەدەبیاتی گەلی کورد دەبێ بە هەموو شێوە و زارێک شیعری بۆ بنووسرێت- تاکو دەوڵەمەند و ئەوەندە بێت کە لە هەر کوێیەکیەوە دەستت بۆی برد، هەتیو و لاواز نەبێت؟!

دەبێ ئەوەش بڵێم لەناو ماچۆ گۆیاندا سەردەمانیک ئەوەش باو بووە کە شاعیران شانامەیان نووسیوە، چیرۆکە شیعری کورتیان نووسیوە، وەرگێڕانیان کردووە، داهێنانیان لەناو ئەو نووسین و شیعرانەدا کردووە کە وەریان گێڕاوە... جگە لەوەش شیعریان بەزمانەکانی دیکە نووسیوە، ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە لەلای گۆرانەکان زیاتر هەوڵی کوردی نووسین دراوە، کەمتر ئاوڕ لە زمانەکانی دیکە دراوەتەوە، وەرگێڕانیش بە زیادکردنەوە هەوڵێکی تری ئەو شاعیرانە بووە، دەبێ لەم باسەدا مێژووی ئەدەبیات ئاوڕی لێ بداتەوە و بنرخێنرێت و بەگشتی باسی لێوە بکرێت.

جگە لەوەی کە دکتۆر باسی لێوە کرد و سەرنج و تێبینی خۆمم لەبارەوە وت، دکتۆر ئاماژە بەوە دەدات: «هەندێ شاعیری گەلانیتر هەم کە بە زمانی ئەو گەلە شیعریان نووسیوە و تاقە پێوەندییان بە کوردەوە ئەوەیە کە بە ڕەچەڵەک کوردن. دیارە لەبارەی ئەم چەشنە شاعیرە هەر دەتوانین ئەوە دووبارە بکەینەوە کە چەند ساڵێک لەمەوبەر لە باسی یەکێک لەو چەشنە شاعیرەدا نووسیبوومان ئەویش ئەوەیە:

ئەم چەشنە شاعیرە لە تۆوی درەختێک دەچن کە با لە چیاوە هەڵیگرێ و بیباتە دەشت و بیابانێکی دوور فڕێی بدات...».

من بۆ خۆم پێم وایە پێویست بەوە ناکات ئێمە بێین قسە لە سەر نیزامی و شەوقی و ڕەسافی و... هتد بکەین، چونکە ئەوان ئەگەر بە هەردوو سەر کورد نەبووبن، لە یەک سەرەوە کوردن و تەنها چەند شتێکی کەمیان نەبێت کە ئاماژەیان بۆ کورد کردووە، ئیدی چی ئەیانبەستێتەوە بەکوردەوە... دەبێ بپرسین نیزامی چی بۆ کورد نووسیوە، ڕەسافی لەوانەیە بڵێین ئەوە هەندێ شتی نووسیوە، ئەی باشە لەوانەش بپرسین ئەی ئەو زانا و شاعیرانەی خۆمان کە بەزمانی بێگانە شتیان نووسیوە، بۆ بخرێنە ناو مێژووی ئەدەبی کوردییەوە، لە وەڵامی ئەوەدا پێویستە بڵێم ئەوان لەوانەیە زەمان و سەردەم وای کردبێت ئەوان بەو شێوە و بەو جۆرە بنووسن، وەکو دەبینین لە ساڵانی ١٧٠٠- ١٩٠٠ کورتە چیرۆک و شانامە لەناو شاعیرانی گۆراندا زۆر باو بووە، ئەڵبەتە کاری وەرگێڕانیش لەو دەمەدا لە زمانی فارسییەوە زۆر نووسین و داستان وەرگێڕاون... بۆیە دەڵێم کورد ئەوەندە شاعیری زۆرە، پێویست بەوە ناکات بێین شاعیری وەکو نیزامی و شەوقی و ڕەسافی و... هتد بێنین قسەیان لە سەر بکەین.

ئەگەر هاتوو ئەمانە لە ناو مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا جێگەیان بکەینەوە، بۆ نموونە: نیزامی گەنجەوی لە ساڵی ٥٣٥ی کۆچیدا ژیاوە، ئەمەش لە پێش بابا تاهیری هەمەدانییەوەیە، دەبێ یەکەم کەس باس لە بابا تاهیر نەکەین، ناشکرێت بەرگێکی تایبەتی بۆ ئەو شاعیرانە دابنێین کە سەرێکیان یان خۆیان هەر کورد بوون و خزمەتی تەواویان بە زمانەکانی تری کردووە و لە مێژووی وڵاتانی تریدا باسیان کراوە و لەلای ئێمە باسیان نەکراوە، نموونەش نیزامی گەنجەوی کە دایکی کوردە و خەمسەی نیزامی هەیە و خزمەتی بە گەلی کورد نەکردووە، ئەو خزمەتەشی کە کردویەتی لە بۆ فارس ئەژمار دەکرێت و فارسیش شانازی پێوە دەکات، من لامولیە ئەگەر باس نەکرێت، ئەگەریش باس دەکرێت لە ڕیزبەندی شاعیرانی کورددا دابنرێت و بەرگی تایبەتی بۆ ئەو شاعیرانە جیا نەکرێتەوە، هەر چۆن فارس لە ڕیزبەندی شاعیرانی خۆیدا حیساب بۆ بابا تاهیر و نیزامی گەنجەوی دەکات، دەبێ ئێمەش ئەگەر حیسابیان بۆ بکەین، دەبێ وەکو ئەوان حیسابی بۆ بکەین.

سەبارەت بە گەڕان و پشکنینی بۆ ئەم شاعیرانە، پێم وانییە گران و ئەستەم بێت، ئێمە چەند وڵاتێک دراوسێمانن، لەوانە: عێراق، سوریا، تورکیا، ئێران، ئازەربایجان، ڕووسیا... هتد.

ئەمانەش دەتوانین مێژووی ئەدەبیاتەکەیان بخوێنینەوە، هەرچی شاعیرێک کونییەی کوردێتی پێوە بێت دەریان بهێنین و قسە و باسیان لەبارەوە بکەین، بە خوێندنەوەی مێژووی ئەدەبیاتەکەشیان دەتوانین ڕێچکەی نووسینەوەی ئەدەبیاتەکەشیان بزانین و سوودی لێ وەربگرین.

لە باس و خواسێکی دیکەدا دکتۆر لایەک لە ئەدەبیاتی فۆلکلۆر دەکاتەوە، وەکو خۆی دەڵێت: «یەکەم: دیار نەبوونی خاوەن بەرهەم.

دووەم: شەقڵی بەکۆمەڵ نووسین و بەرهەمهێنان بەو چەشنە ئەدەبییەوە دیار بێت.».



عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ

ڕوون وئاشکرایە فۆلکلۆر ناوی خاوەنەکەی دیار نییە، بەڵام ئەگەر بەنێو ئەو دیوان و دەستنووس و بەیازانەدا بڕۆینەوە، هەندێک لەوانەمان بۆ ساغ دەبێتەوە کە خاوەنەکانیان کێیە، بەندە لە کاتی کۆکردنەوەی دیوانی خانای قوبادی و میرزا شەفیع و بێسارانی دا هەندێک لەو شیعرانەم بۆ ساغ بووەوە کە کرابوون بە فۆلکلۆر و لە جێگەی خۆشیاندا ئاماژەم بەوانە کردووە و دەیکەم.

ئەم شیعرە فۆلکلۆرییانە چۆن بوون بە فۆلکلۆر؟ هەر ئەو شیعرانەن کە لەناو بەیاز و دەماودەمەوە هاتوون و خاوەنەکانیان لەبیر چووەنەتەوە، بۆ نموونە: وەکو دەبینین لە هەندێ کەشکۆڵ و بەیازدا لە سەر هەندێ شیعر نووسراوە (نازانم هی کێیە، لا اعلم...) ئەمانە لە کێوە وەرگیراون، ئایا هەر کەسێک نەبووە کە یەکێک بەدەم وتوویەتی و میرزایەک یان مەلایەک لەناو دەستنووس و بەیاز و کەشکۆڵەکانیاندا نووسیویانەتەوە و بە ئەمانەتەوە وتوویانە نازانین هی کێیە، هەر بۆیە لەناو مێژووی ئەدەبیاتدا ئەگەر بێت و ئەوەمان بۆ ساغ نەکرایەوە، ئەوا دەتوانین بەشێوەی فۆکلۆر مامەڵەی لەگەڵدا بکەین، ئەگەر بێت و تەنها مێژووی ئەدەبیاتەکەی مامۆستا سەجادی بە مێژووی ئەدەبیات بزانین، ئەوا زۆر هەڵەین، هەروەها لە مێژووی ئەدەبیاتی وڵاتانی تریدا تەنها باس لە شیعر و هەندێ لایەنی تایبەتی قسەی لە سەر نەکراوە، بەڵکو مێژووی ئەدەبیات دەبێ لە لایەنی گشتییەوە دەست پێ بکات و لەلایەنی تایبەتیش خۆی نیشان بدات و باس و خواسە گرنگەکان دیاری بکات و لە سەر لایەنە گرنگەکان بووەستێت.

ناشبێت خۆمان لە هەندێ بوار ببوورێنین و پشتگوێی بخەین، بە بۆچوونی من دەبێ سەر لە هەموو لایەنەکان بدەین و بیانجوڵێنین، چونکە ئەگەر ئێمە نەیکەین یان کەسانی وەکو دکتۆر عەزەدین خۆیان لەو بوارە نەدەن، دەبێ کێ بێت خۆی لەو بوارە بدات؟!

سەبارەت بەوەی کە ئێمە چۆنێتی گرتنەبەری ڕێبازی شاعیران کار بکەین، یان دکتۆر لەو بڕوایەدایە کە دەبێ لە سەر ڕێبازی شاعیران کار نەکەین، مەبەست لەوەیە کە شاعیر سەر بەچی ڕێبازێکە، ئەگەر بەم شێوە بڕۆین ئەوا دەکەوینە هەڵەی زۆر گەورەوە، منیش هەمان ڕای دکتۆرم هەیە، یان دەبێ بەپێی ساڵی تەمەن ڕێبازەکە بگرینە بەر، ئەمەیان لە هەمووی سەرکەوتووترە بەلای منەوە، چونکە لەم ڕێگەیەوە زۆر قۆناغمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، دەتوانین بەئاسانی بەسەر هەموو لایەنەکاندا زاڵ ببین، قۆناغەکانی ژیانی شاعیران و مێژوو و کەلتوور و کەلەپوور و فەرهەنگ و زمان و کەسایەتی و باری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و... هتد بۆ ڕوون دەبێتەوە بەگشتی و بەتایبەتیش.

بەڵام لە هەر حاڵەتێکدا بۆ مەسەلەی ئەوەی کە ئێمە شێوەزارمان زۆر و قۆناغەکان گۆڕانیان بەسەردا دێت، ئەمە گرنگایەتی ئەوە کەم ناکاتەوە کە ئێمە لە سەر ژیانی شاعیران بەرنامەی نووسینەوەی مێژووی ئەدەبی کوردی بنووسینەوە، ئەگەر لە سەر ئەم پەیڕەو و پرۆگرامە وتی: (لە سەر ساڵی لە دایکبوون مێژووی ئەدەبیات نەنووسین) ئەوا هەڵەی زەق و گەورە لە مێژووی ئەدەبیاتی ئێمەدا ڕوو دەدات و دەردەکەوێت. چونکە شێوەزار لە زمانی کوردیدا بۆ ئێمە لە لایەنێکی دیکەوە گرنگە، ڕۆشتن لە سەر ساڵیش لایەنی گرنگی زۆرمان بۆ دەردەخات و قۆناغی گرنگی زمانمان بۆ دەسنیشان دەکات وەکو لە پێشەوە خستمە ڕوو.

ئەوەش ڕاستە کە دیالێکت و شێوەزاری زمانی کوردی خاسێت و تایبەتمەندی خۆی هەیە، ئاخر ئەم خاسێت و تایبمەتمەندییە گرنگەیە لە دیالێکت و شێوەزاردا وا دەکات نووسینەوەی مێژووی ئەدەبیاتی کوردی ئێمە لە



د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ

سەر ساڵی لە دایکبوونی ژیانی شاعیرەکان بڕۆین بەڕێوە... ئەگەر بێت و لە سەر بەرنامە و پرۆگرامی میرنشینایەتیش بڕۆین بەڕێوە، لەمەشیاندا دەکەوینە هەڵەیەکی زەق و گەورەوە، چونکە هەندێ ناوچە سەردەمانێک لە ژێر دەسەڵاتی سەفەویدا بەبێ میری کوردی ڕۆشتووە بەڕێوە، هەندێجاریش ئەم میرنشینانە سەر بە سەفەوی یان عوسمانی بوون، جارجارەش سەربەخۆ بوون و پاڵیان بە هیچ دەوڵەتێکەوە نەداوە، ئەمانە هیچ خاسێت و گرنگییەک بە نووسینەوەی مێژووی ئەدەبیاتی ئێمە نادات، بە بڕوای من گەورەترین هەڵە ڕوو دەدات و حەقی زۆر شاعیر و زاناشمان لەو نێوەندەدا دەڕوات...

لە سەروتردا باسمان لەوە کرد کە ئێمەی کورد جێگای شانازییە جگە لە زمانی خۆمان زمانەکانی وەک عەرەبی و فارسی و تورکی و هەندێجاریش ڕووسی و ئینگلیزیمان زانیوە... نموونەشمان لە سەر ئەوە هێنایەوە کە هەندێ شاعیرمان تا سەردەمانێک ئەگەر شیعریان بەزمانی فارسی یان عەرەبی یا تورکی نووسیوە و شیعریان بە زمانی تری دەرنەکەوتووە، ئەوا ئێستەکە زۆر شتمان هەیە کە دەرکەوتوون و ساغ کراونەتەوە... پێویستە ئێمە نکۆڵی لەوە نەکەین و ئەوە بەوە ئەژمار نەکەین کە ئێمە نابێ نووسین و نووسراوەکانی شاعیرانمان کە بەزمانی تر نووسراون نابێ لە مێژووی ئەدەبیاتماندا باسی نەکەین و ونی بکەین... هەر وەکو ئەوەی کە هەندێ کەس دەڵێن: کورد خۆی مێژووی خۆی نەنووسیوەتەوە و بێگانە و ڕۆژهەڵاتناسەکان مێژووی گەلی کوردیان نووسیوەتەوە، من هەمیشە پێچەوانەی ئەوانە ڕاوبۆچوونم هەیە، ئێمە مێژووی خۆمان نووسیوەتەوە، بەڵام لەکاتی داگیرکاری و شەڕ و ماڵوێرانییەکاندا لەناو براون... ئەمەش هەمان شتە کە ئێمە بەشێک لە مێژووی ئەدەبیاتی خۆمان حاشای لێبکەین و نەیخەینە ناو مێژووی ئەدەبیاتەوە و بڵێین ئەمە بەشێک نییە لەو مێژووەمان، پێویستە ئەمەیان بەجیا قسەی لە سەر بکرێت، بەڵکو لە سەر ئەو ڕایەی دکتۆرم کە دەبێ لەناو مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا لە تەنیشت زمانی کوردییەوە باس لەو زامانانەی تریش بکرێت کە شاعیران و نووسەرانی ئێمە لە سەردەمە جیاوازەکاندا نووسین و نووسراویان پێ نووسیوەتەوە، ئیتر پەخشان بێت یا شیعر یان داستان و... هتد.

لەناو شاعیرانی کورددا زۆرن بەو شێوەی نالی بیریان کردووەتەوە، وەکو خانای قوبادی، ئەڵماس خانی کەنووڵەیی، حەسرەتی گۆرانی....

لاشم وایە سوود وەرگرتن لە مێژووی ئەدەبیاتی عەرەبی بۆ ئێمە زۆر نەگونجێت، دەتوانین ئەوەندە سوود لە ئەدەبیاتی فارس وەرگرین، ئەوەندە سوود لە عەرەب وەرنەگرین، چونکە فارس زەمینەیەکی باشتر و هەیکەلدارتری هەیە لە نووسینەوەی مێژووی ئەدەبیاتدا تاکو عەرەب، پێشکەوتوویی و زەمینەسازی و خاوەن بەرهەم و کاریگەریی و کەلتوور و کەلەپوور... ئەمانە بوونیان لەناو ئێمەدا زۆرە و دەگمەن نییە، هەروەها کورد زۆرتر سوودی لە فارس وەرگرتووە تاکو عەرەب، ئەگەرچی هەندێ کەس لە ڕێگەی ئایینی ئیسلامەوە کاریگەری لە سەر دروستبووە و سوودی لە عەرەب وەرگرتووە، بەڵام کاریگەری فارس لە سەر کورد زیاترە تاکو عەرەب.

پێشموایە نووسینەوەی مێژووی ئەدەبی کوردی لە سەر ساڵی لە دایکبوون بنووسرێتەوە، وەکو لە پێشتر باسم لە گرنگایەتی و سەرکەوتوویی کردووە، جگە لەوەش ناوچەگەرایەتی تێدا نەکرێت، چونکە هەندێک مێژووی ئەدەبیاتی تری کە پێشتر نووسراونەتەوە، ئەو خاڵەیان تێدا دەبینرێت، بۆ نموونە: مێژووی ئەدەبی کوردی دکتۆر مارف خەزنەدار، ئەم مێژووە بەدەیان هەڵە و بە سەدان شاعیر کە ڕۆڵیان لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا هەبووە، لەبیر کراون و ناویان نەهاتووە، لەوانە: بێداری شاعیری گەرمیانی، دەرویش حوسێن، میرزا شەفیعی جامرێزی، حەسەن کەنۆش، فاتمەی حەسەن کەنۆش، دێوانە....

دکتۆر دوابەدوای ئەمانە دێتە سەر ئەو بڕوایەی بڵێت: «کەواتە ناتوانین ڕێکوڕەوان لە ساڵی (١٨٠٠)ەوە دەست پێ بکەین و لە ساڵی (١٩٠٠)دا بیبڕینەوە. بەکورتی ئەگەر بێت و لەم باسی ساڵ و مێژووی ڕووداوەدا بەو پێیە ڕەنگێک بۆ دابەشکردنی پلەکانی ئەدەبیاتی کوردی بڕێژین هەر بەم چەشنە دەست پێ بکەین.

١- ئەدەبیاتی کوردیی پێش ئیسلام.

٢- ئەدەبیاتی سەردەمی موسوڵمانبوونی کورد تا چەرخی دووەمی عەباسی.

٣- سەرەتاکانی ئەدەبیاتی کوردی تا پەیدابوونی میرنشینەکان.

٤- ئەدەبیاتی کوردیی سەردەمی میرنشینەکانی کورد تا کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی.

٥- ئەدەبیاتی نوێ یا ئەم سەردەمە لە جەنگی یەکەمی جیهانەوە تا ئەمڕۆ بەردەوامە و ڕەنگە بەسەر نوێ و هاوچەرخدا لەناوەوە دابەشکرێت.».

دکتۆر لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێت: « بێگومان ئەگەر باش لەم دابەشکردنە وردببینەوە دەبینین کە لەگەڵ هەندێ دابەشکردنی تردا یەکدەگرێتەوە...».

هەروەها دکتۆر دوابەدوای ئەوەش دەڵێت: «تازەترین دابەشکردنی قۆناغەکانی ئەدەبیاتی گەلان ئەو

عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ



دابەشکردنەیە کە مێژووی ئەدەبیات بەپێی قوتابخانەی ئەدەبی دابەش دەکات، ئەمە بۆ ئەدەبیاتی کوردیش بە تەواوی دەگونجێ...».
لەم قسانەی دکتۆردا هەندێک سەرنج و تێبینی و وردە باس هەن دەبێ لێیان ورد بینەوە، ئەمجا بێین ئەو دابەشکردن و قۆناغ و بەرهەم و نووسینانەی وڵاتانی دراوسێ بهێنین و تەماشایان بکەین و لەگەڵ ئەوانەی خۆماندا بەراوردیان بکەین، بزانین مێژووی ئەدەبیاتی ئەو میللەتانە لە چ سەردەم و قۆناغ و کاتێکدا زۆر کاریگەرییان لە سەر ئێمە هەبووە، ئەمە لەو قۆناغەدا قسە و باسیان لە سەر بکەین و مێژووی ئەدەبیاتی کوردی لەو قۆناغەدا بەپێی قۆناغی مێژوویی ئەو وڵاتە بنووسینەوە، بۆ نموونە: ئەگەر لە پێش ئیسلامدا- چ ئایین و پەیڕەو و پرۆگرامێک کاریگەری لە سەرمان هەبووە، بەپێی ئەو پەیڕەو و پرۆگرامە کار بکەین، لە سەردەمی ئیسلامدا، ئەگەر کاریگەری ئیسلامە، با پەیڕەوی مێژووی ئەدەبیاتی عەرەب و لە سەردەمی دوای ئەوەدا کە فارسە- با ڕێبازی فارس بگرینەبەر، بەڵام وادەزانم ئەمەش گرنگی خۆی دەبێت....
نموونەشم بۆ ئەم قسانەم ئەوەیە، ئێمەی کورد لە پێش هاتنی ئایینی ئیسلام کە دەڵێن ئێمە ئارياييين، دیارە کاریگەری ئەومان لە سەر بووە، لە سەردەمی ئیسلامدا زانایانی کورد کاریگەری ئایینی ئیسلامیان لە سەر بووە، دوای ئەمە لە زۆربەی جێگاکاندا کاریگەری فارسمان لە سەرە، لە هەندێ جێگای دیکەدا کاریگەری تورکمان لە سەرە....
ئەمە هەندێ قۆناغ و پەیڕەو و پرۆگرام و بەش و لق و پۆپمان بۆ دەکاتەوە کە گرنگی و سەرکەوتوویی شاعیرانی کورد و فەرهەنگ و مێژوو و زمان و کەلتوور و کەلەپوورمان- گرنگایەتییەکی دەبێت کە خۆمان لە وڵاتانی تری پێشکەوتووتر دەبینین، لە هەموو ڕوویەکەوە.. لەوانەشە بڵێن ئەمە چۆن و بۆچی؟
دەڵێم: دەبینین لە پێش ئیسلامدا مێژووی ئەدەبیاتی ئێمە چۆن بووە، بە هاتنی ئایینی ئیسلام چۆن بووە، کاتێک بووین بە دوو پواز یان سێ پوازەوە، هەندێ لەو شاعیرانەی کاریگەری عەرەبیان بەسەرەوەیە شیعرەکانیان چۆنن، ئەوانەی فارسن چۆن بووە، هەروەها تورکیش بەهەمان شێوە، بەڵام لەم نێوەندەدا شاعیرمان هەیە دوو فەرهەنگ کاریگەری لە سەر هەبووە، فەرهەنگی عەرەب و فارس، یان عەرەب و تورک، یان تورک و فارس، یان هەر سێ فەرهەنگەکە کاریگەری لە سەر هەبووە، ئەمەش خۆی بۆ خۆی قۆناغ و لق و پۆپێکە لەناو مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا جێگای تایبەتی خۆی هەیە کە لە هەندێ مێژووی ئەدەبیاتی وڵاتانی تریدا نییە...

ئەم قۆناغ و لق و پۆپ و دابەشکردنەش بەپێی ڕێبازەکان و گونجانیان پێم وایە مەحاڵە... بەڵام بەپێی ساڵ ئەوە گونجاوترە، چونکە لەوانەیە یەکێک لەو شاعیرانە لە کۆتایی ڕێبازێک و سەرەتای ڕێبازێکی نوێدا ژیابێت.. دەبێتە هۆی باسکردنی لە دوو ڕێبازدا... ئەمەش تێکەڵ و پێکەڵی دروست دەکات...
حەز دەکەم لە باسی ئەم قۆناغ و دابەشکردنەدا ناوەڕۆکی مێژووی ئەدەبیاتی فارسی کە دانانی دکتۆر زەبیحوڵڵای سەفایە، لێرەدا بیخەمە ڕوو:
«باب اول:
وضع سياسي و اجتماعي و علمي و ادبي ايران، از حملةو عرب تا پايان قرن سوم هجري.
فصل اول:
وضع سياسي و اجتماعي ايران از غلبةو عرب تا قيام يعقوب ليث
وضع عمومي ايران مقارن ظهور اسلام
حملةو تازيان
از فتح الفتوح تا قيام ابومسلم
از قيام ابومسلم تاحكومت يعقوب بن ليث
وضع اجتماعي ايران تا قيام يعقوب
شعوبية
قيامهاي سياسي و نظامي تاظهور يعقوب بن ليث صفار
قيام يعقوب بن ليث صفار و تشكيل سلسلةو صفاري
فصل دوم:
وضع ديني ايران تا پايان قرن سوم هجري
وضع عمومي اديان ومذاهب در ايران
آغاز اختلافات مذهبي
خوارج
شيعة
مرجئة
اختلاف در اصول عقايد
قدرية
مجبرة
معتزلة
چند فرقةو ديگر
حلولية واهل تناسخ
خلاصةو وصع ديني و مذهبي
فصل سوم:
وضع علوم در سة قرن اول هجري
تقسم علوم
١- علوم شرعية
علم القراءة






علم تفسير

علم الحديث

علم فقة

علم كلام

٢- علوم عقلية

تعريف علوم عقلي

تازيان و علوم عقلي

تأثير ايرانيان در تدوين علوم عقلي

اغاز توجه مسلمين بعلوم عقلى

مراكز علمى مقدم برحوزەو بغداد

علوم عقلى در ايران پيش از اسلام

مترجمان ايراني

مترجمان غير ايراني

حاصل كار مترجمان

علماي قرن دوم و سوم

٣- علوم ادبية

تعريف واقسام علوم ادبي

علل توسعەو ادب عربى

روايه ورواه

علوم لساني

فصل چهارم:

وضع ادبي ايران در سة قرن اول هجري

١- ادبيات پهلوى

ادامەو ادب پهلوى

ناقلان كتب پلهوى

كتب مشهور پهلوى

٢- وجع عمومى ساير لهجات ايرانى تا آغاز ادبيات فارسي

لهجات محلي

شعر درلهجات محلي

ورود لغات عربي

استعمال خط عربي

٣- لهجەو درى

٤- اۜغاز ادب فارسى

نخستين شاعر پارسى گوى

بهرام گور

عباس مروزى يا ابوالعباس مروزى...

ابوحفص حكيم بن احوص شغدى....

٥- نثر و نظم عربي درايران

نثر عربي

شعر عربي

باب دوم:

وضع سياسى واجتماعى وعلمى وادبى ايران درقرن چهارم و نيمەو اول قرن پنجم

فصل اول:

وضع سياسى واجتماعى ايران در قرن چهارم و نيمەو اول قرن پنجم

١- وضع بغداد و خلفا تاتسلط طغرل بيط

٢- حكومتهاى ايران از ێغاز قرن چهارم تاتسلگ سلجوقيان

دنبالەو حكومت صفاريان

سامانيان

حكومتهاي تابع سامانيان

امراي طبرستان

ديالمەء آل زيار

ديالمەء آل بويه

ديالمەء آصفهان

دروەى اول حكومت غزنوى

حكومتهاي مغرب

٣- وجع اجتماعى ايران درقرن چهارم و اوايل قرن پنجم




حکومتهاي ايراني
خاندانهاي قديم ايراني
رسوم واداب ايراني واباداني وثروت
بردگی وبردگان
غلامان و كنيزكان ترك
مبارزات نذادي ايران وترك
نتايج تسلط غلامان
فصل دوم:
عقايد واديان و مذاهب درقرن چهارم وآغاز قرن پنج
بقاياي اديان قديم
مذاهب اسلامي
عصبيات مذهبي
مذهب اشعري
نتايج نفوذ اصحاب حديث واشاعرة
وضع شيعة
فرقةو اسمعيلية
قرامطه
صوفية
فصل سوم:
وچع علوم درقرن چهارم و نيمەو اول قرن پنجم
رواج علم....
١- علوم شرعية...
٢- علوم عقلي...
علوم رياضي درقرن چهارم واوايل قرن پنجم...
علم طب...
صيدنة وساير اقسام علوم طبيعي
جغرافيا...
٣- علوم ادبي...
فصل چهارم:
وچع ادبی ايران در قرن چهارم و نيمەو اول قرن پنجم
١- وضع عمومي زبان وادب فارسي
٢- شعر فارسی در قرن چهارم و نيمەو اول قرن پنجم....
٣- نثر پارسی درقرن چهارم و نيمەو اول قرن پنجم...
٤- تازی گويان ايران در قرن چهارم و اغاز قرن پنجم...
فهرست اعلام تاريخي و جغرافيايي وفرق و اقوام و كتب ورسالات از...».

دەبینین ئـەم دابەشکردن و وردەکارییە دەبێتە هۆی نووسینەوەی مێژووییەکی ئەدەبی گرنگ، کە هەموو لایەنەکانی لەخۆ دەگرێت و گرنگایەتی هەموو لایەنەکان دەخاتە ڕوو، هەر بۆیەش دەڵێم ئێمە زیاتر سوود لە مێژووی ئەدەبیاتی فارس وەربگرین باشترە، تاکو عەرەب، هەر لەبەر ئەم هۆیە فارسەکان بەشێوەیەک قۆناغەکانیان دابەش کردووە، لە هەموو ڕوویەکەوە لە ئێمەوە نزیکن و بەپێچەوانەشەوە هەر ڕاستە...

وەکـو وتـم: ئێمە شاعیرمان هەیە لەناو دوو قۆناغدا ژیاوە یان دوو یا سێ زمان کاریگەری لە سەر هەبووە، نموونەشمان زۆرە، خانای قوبادی، کاریگەری عەرەب و فارسی لە سـەرە، ئەڵماس خان فـارس و عـەرەب و دژ بە تورک و عەرەب و فارسیش کاری کردووە، ئەگەرچی هەندێ کاریگەری لە سەر هەبووە، نالی کاریگەری فارس و عەرەب...

بۆ هەر بەش و قۆناغ و لق و پۆپ و... دەبێت گەڕان و پشکنینێکی باش بکرێت، بەڵام بە ورياييەوە، چونکە ئـەگـەر وريـا نەبین، وەکـو دکـتـۆر سدیق سەفی زادە دەکەوینە هەڵەی واوە کە مێژووی ئەدەبیاتەکە نەبێتە سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراو، بۆ نموونە: سدیق سەفی زادە کاتێک بەناو ئەو سەرچاوە کۆن و نوێیانەدا گەڕاوە و شتی وەرگرتووە، بێ دوو سێ شیعری شاعیرێکی دیکەی داوەتە پاڵ شاعیرێکی دیکە، یان شاعیرێکی بەدوو ناو داناوە، بۆ نموونە: ئەڵماس خانی بە سێ ئەڵماس خان هێناوە، لەکاتێکدا خۆی دوو ئەڵماس خانە.

هەر بۆیە دەڵێم: گـەڕان و پشکنین و پرسیار کردن و گردوکۆکردنەوەی هەموو ئەو سەرچاوانە و بە ورياييەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت، تەنها مەبەست لەوەیە، ئەم مێژووەی فارس نووسیویەتی ئەگەرچی زۆر وردبووەتەوە تێیدا، بەڵام لە هەڵەش بەدەر نییە، مێژوویەکە دەتوانن پێی بڵێن مێژووی ئەدەبیات و بە دڵنياييەوە پشتی پێ ببەستن.

کۆی قسەکانم لەم چەند خاڵەدا کۆ دەکەمەوە و دەڵێم:

١- پێویستە نووسینەوەی مێژووی ئەدەبیاتی کوردی بە لیژنە بنووسرێتەوە لەم قۆناغەدا، ئەگەریش بە تەنها بنووسرێتەوە، پێویستە دکتۆر بۆ هەر بەرگێک چەند ساڵێک دابنێت و گەڕان و پشکنین و پرسیارێکی باش بکات و چەند ناوچە و وڵاتێک بگەڕێت بەدوای سەرچاوەی گرنگی ئەو بەرگەدا.

٢- لاکردنەوە بەسەر هەموو لایەنەکانی مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا، وەکو چۆن فارسەکان لایان لە هەموو قۆناغەکان کردەوە، بۆ دەرخستنی لایەنە باش و خراپەکانی مێژووی ئەدەبیاتی کـوردی، دەبـێ ئـەوەش بڵێم: بەشێکم لەو ناوەڕۆکەی ئەدەبیاتی فارسی بڕیوە و کەمم کردووەتەوە، لەو جێگایانەی کە لێم بڕیوە نیشانەی (...) سێ خاڵم داناوە.

٣- دابەشکردنی مێژووی ئەدەبیاتی کوردی وەکو ئەوەی قۆناغی ژیانی ئێمە چۆن گـوزەراوە، سوود لە مێژووی

ئەدەبیاتی عەرەبی و فارسی وەربگیرێت، وەکو بینیمان لە پێشەکییەکەی دکتۆردا، هیچ باسی مێژووی ئەدەبیاتی فارسی نەکردووە، بگرە زۆر باسی لە عەرەب کردووە، ئەمەش خاڵێکی لە سەرەتاوە فەرامۆشکراوە لە مێژووی ئەدەبەکەی دکتۆردا.

٤- سوود لە مێژووی ئەدەبیاتی سدیق سەفی زادە و بابا مەردۆخ و ئەوانی دیکە وەربگیرێت و ئەو شاعیرانەی پێش بابا تاهیر ناویان هاتووە، بخرێنە لیستەکەوە...

٥- ئەو شاعیرانەی کە سەرێکیان کوردە یان هەر لە بنەچەدا کوردن و بەزمانی تر نووسینیان هەیە، بەرگیان بۆ جیا نەکرێتەوە و هەر لە ڕیزبەندی شاعیرانی دیکەدا ئەژمار بکرێن.

٦- باسێک لە پەند و قسەی نەستەق و.... شانامەی کوردی و داستانە شیعر و وەرگێڕان و فەرهەنگنووسیش بکرێت.

٧- باسێک لە مێژووی نامە و نامەی شیعری بکرێت، چونکە ئەمەش لایەنێکی فەرامۆشکراوە لە مێژوودا.

٨- سوود لە مێژووی ئەدەبیاتی ناوچەییەکان وەربگیرێت، چونکە ئەمەش کارئاسانین بۆ نووسینەوەی مێژووی ئەدەبیاتی کوردی...

٩- ڕیزبەندکردنی شاعیران بەپێی ساڵی لەدایکبوونیان نەک بەپێی قۆناغ یان میرنشین یان ناوچەیی.... هتد.

من نووسینەکانم لەم چەند خاڵەی سەرەوەدا گردوکۆ کردنەوە، ئەڵبەتە قسەکردن لە سەر مێژووی ئەدەبیات و ئەدەبیاتی کوردی بەتایبەتی بەم چشنە نابێت، بەڵام لەبەر هەڵسەنگاندن و سەرنج و تێبینی و خستنەڕووی هەندێ لایەن و خاڵی تایبەتی و جەوهەری و ناوەڕۆکی و سەرەتایی و تاکەکەسی و پەلەیە، هەر دەبێ بەم شیوە قسەی لە سەر بکرێت، دەنا بەندە کە لە بواری ئەدەبیانی کوردیدا کار دەکات و دەیان سەرچاوەی دەگمەنی لە بەردەستدایە بۆ نووسینەوەی مێژووی ئەدەبیاتی کوردی- خاڵی گرنگ و بایەخدان، لەم دەمودەسەدا هەر ئەوەندەیە کە بەم شێوە قسە لە سەر تەنها پێشەکی کتێبەکە بکرێت، چونکە وتراوە پێشەکی پوختەی کتێبەکەیە و خوێنەر دەیخوێنێتەوە.

هیوادارم لەم خوێندنەوەیەدا توانیبێتم تیشکێک بخەمە سەر باسەکە، ئەم قسە و باسانەش کە لێرەدا خستومنەتە ڕوو، تەنها مەبەستم لە خزمەتکردن و نووسینەوەی مێژووییەکە کە هەر کاتێک پێویستمان بوو، یان دەستمان بۆی برد، وەکو گەوهەر بێت یان وەکو قوتووی عەتار وەهابێت.... بێ هەڵە و کەموکورتی بێت و ئەوەی مەبەستمانە تێیدا دەستمان بکەوێت، لە هەڵە و کەموکورتیم ببوورن.


### سەرچاوەکان:

١- تاريخ ادبيات ايران: دكتر توفيق هـ. سنجابی، چاپی دوەم، چاپی خاشع، ١٣٨٨.

٢- تاريخ ادبيات در ايران: دكتر ذبيح الله صفا، بەرطي ١-٦، چاپی دەهەم، چاپخانەی کیهانك- تهران، ١٣٦٩.

٣- حەدیقەی خوسرەوی: میرزا عەبدوڵڵای سنەیی- لێکۆڵینەوە و کردنی بە کوردی- محەمەد ئەمین «کاردۆخی»، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپخانەی ئاراس- هەولێر، چاپی یەکەم، ٢٠١٣.

٤- سرود بادية «در احوال و آثار شعراي كرد و لك و لر»: استاد ملا محي الدين صالحي، انتشارات كردستان، چاپخانه رستمخاني، ١٣٨٠.

٥- شاعيران كرد پارسی گويی: سيد عبدالحميد حيرت سجادی، نشر احسان، چاپخانه پيام، چاپ اول، ١٣٧٥.

٦- شتێ لە ئەدەب و ژیان: عومەر عەزیز مەحوی، چاپی یەکەم، بەرگی یەکەم و دووەم، چاپخانەی ئەزمەڕ، ٢٠٠٩.

٧- فرهنگ ادبيات فارسی: شريفی محمد، محمد ١٣٤٥، چاپی پێنجەم، ١٣٩١، فرهنگ نشر نو- انتشارات معين.

٨- گوڵزاری شاعیرانی کورد: بێدار شارەزووری، بەرگی یەکەم، چاپخانەی چوارچرا، چاپی یەکەم، ٢٠١٣.

٩- مێژووی زانایانی کورد: مەلا تاهیر مەلا عەبدوڵڵا بەحرکەیی، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاراس، ٢٠١٠.

١٠- مێژووی ناودارانی کورد: بابا شێخ مەردۆخ ڕۆحانی (شێوا)، ماجد مەردۆخ ڕۆحانی وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، بەرگی یەکەم و دووەم، چاپی یەکەم، هەولێر- ٢٠١١.

١١- مێژووی وێژەی کوردی: صديق بۆرەکەیی (صفی زادە)، بەرگی یەکەم و دووەم، چاپخانەی چهر تبريز- انتشارات ناجی- بانە کوردستان، چاپی یەکەم، (١٣٧٠خ).

١٢- مێژووی ئەدەبی کوردی: پرۆفیسۆر. د. عیزەدین مستەفا ڕەسول، بەرگی یەکەم، سلێمانی- ٢٠١٢.

١٣- هەڵبجە لە ئامێزی مێژوودا: حەکیم مەلا ساڵح، بەرگی دووەم، شاعیران، چاپخانەی دیلان، ٢٠١٠.

١٤- یادی شاعیرانی کورد: حاجی شێخ حامد حیسامی، چاپی یەکەم، ناشر «حاجی شێخ حامد حیسامی و ئینتیشاراتی مەسعوود»، چاپخانەی ڕۆستەم خانی (تاران)، ١٣٨٢ی هەتاوی.


عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ



# بەشێك لە یادەوەرییەكانم لەبارەی دكتۆر عیزەدین مستەفاوە



محەمەدی مەلا کەریم

وەک لەیادم بێ، سەرەتای ناسینم لەگەڵ برا و هاوڕێی ئازیزم دکتۆر عیزەدین مستەفا، بۆ ساڵەکانی نیوەی دووەمی چلەکانی سەدەی ڕابردوو دەگەڕێتەوە، کە ئێمە هێشتا ماڵمان لە (بیارە) بوو.

من بە وردی نازانم دکتۆر کەی هاتووەتە دنیاوە، بەڵام لەوە دڵنیام کە دوو سێ ساڵێ لەو گەورەترم. تازە جەنگی دووەمـی جیهان بڕابووەوە، خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا مستەفای باوکی دکتۆر، هاتبوو بۆ بیارە و عیزەدینیشی، کە لەم نووسینەدا بەپێی شوێن، گەلێ جار بە «عیززی» ناوی دەهێنم، لەگەڵ خۆی هێنابوو. باوکی هەردووکمان کە لە سەردەمی فەقێیەتیی باوکمەوە لە خانەقای مەولانای سلێمانی لای خوالێخۆشبوو مامۆستا شێخ عومەری ناسراو بە «ابن القرداغی» دەیانخوێند، یەکتریان دەناسی، ئەو ڕۆژانەی هاتنی عیززی و باوکی بۆ بیارە پێکەوە دەبوون.

دیارە دەبێ بەو پێیە من و عیززی نزیکە هاوتەمەنیشم، یەکتری ناسینمان لەو ڕۆژانـەدا دەستی پێ کردبێ، کە تا ئێستایش بەردەوامە و بەڵکو ڕۆژ بەڕۆژیش پتەوتر و خەستوخۆڵتر دەبێ.

دڵنیا نیم لەمەی کە دەیڵێم، بەڵام وای بۆ دەچم عیززی لەو سەردەمەدا قوتابی کۆلێژی شەریعەی بەغدا بووبێ. عیزەدین، بەوپێیە کە لاوێکی خوێندەواری دانیشتووی سلێمانی پڕ لە جموجووڵی سیاسی و کۆمەڵایەتی بوو، منیش بەهۆی ئەوەوە کە لەناو و دەوروبەری خانەقای بیارە و حوجرەی فەقێکاندا دەمخوێند و هەڵدەستام و دادەنیشتم و جگە لە فەقێکانی حوجرەی بیارە، خەڵکێکی هەمیشە تازە هاتووی لە هەموو جۆرێکم دەدی و، سەرەڕای ئەوە خوویشم دابووە ڕۆژنامە خوێندنەوە، کە هەموو ڕۆژێ سێ چوار ڕۆژنامەی جیا جیا، بەڵام تێکڕا لەگەڵ بارودۆخی سیاسی ئەو ڕۆژەی عێراقدا

عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ



گونجاو، دەهاتن بۆ شێخی بیارە و لە دیوەخانەکەی شێخدا دادەنران و گەلێ کەس لە میوانەکانی شێخ دەیانخوێندنەوە. منیش خووم بەوەوە گرتبوو، هەموو ئێوارەیەک دەچوومە سەر ڕێی قەتارچییەکانی ماڵی شیخ کە لە هەڵەبجەوە دەهاتنەوە و ئەو ڕۆژنامانەم لێ وەردەگرتن کە بۆ شێخیان دەهێنان و ئەو شەوە لای خۆمم دەهێشتنەوە، هەرچەند هێشتا زمانە عەرەبییەکەم وای لێ نەهاتبوو باش لێیان حاڵی ببم، دەمخوێندنەوە و سبەینێ دەمبردن بۆ دیوەخانی شێخ. وەک لە قسەی نێوان خۆم و عیززیی ئەو ڕۆژانەوە دێتەوە یادم، ئەو تا ڕادەیەک سەروساختی لەگەڵ سیاسەت، لە لایەنە پێشکەوتخوازانەکەیەوە هەبوو، بەڵام من لە شتێکی گشتی بەولاوەم لێ نەدەزانی. وەک لەیادمە ئەو سەردەمە عیززی، پێشکەوتووانە لەگەڵ سیاسەت بوو، بەڵام من لە سەرەتایەکی کرچ و کاڵی سیاسەتی بەدیمەن ئیسلامی بـەولاوەم تێنەپەڕاندبوو. وردەیـەک ئاشنایەتیم لەگەڵ هەندێک لە بیر و بۆچوونەکانی سەید جەمالەدینی ئەفغانی و شێخ موحەممەد عەبدەدا هەبوو، کە زیاتر ئەوەیشم لە خوێندنەوەی هەندێ کتێبەوە وەرگرتبوو، کە یەک دوانێک لە مامۆستاکانی قوتابخانەی بیارە دەیاندامێ و لە هەندێ کتێبی تری لەو بابەتانە هەبوو. هەر بۆیەیش داوام لە عیزەدین کرد کتێبی (العدالة الاجتماعیه في الاسلام)ی شەهید سەید قوتبم بۆ بکڕێ و بۆم بنێرێ. پاش ماوەیەک ئەو کتێبە و هەروا چەند کتێبێکی تری بۆ ناردم کە یەکێکیان کتێبێکی شەهید عەبدولقادر عۆدە بوو.

ئەمە سەرەتای پێوەندی من و برای ئازیز و خۆشەویستم دکتۆر عیزەدین مستەفا بوو. پاش ئەوە لە یادم نییە جارێکی تر بینیبێتمەوە تا ماڵمان لە بیارەوە هاتە سلێمانی. دیارە لەم ماوەی مانەوەماندا لە سلێمانیش چەندین جار بەیەک گەیشتووین، بەڵام هیچم لەبارەی ئەو دیتنانەوە لەبیر نییە. لە سلێمانیشەوە پاش چەند ساڵ چووینە کەرکوک و پاش چەندین ساڵی تر لەوێشەوە چووینە بەغدا کە ئەمە پاش ساڵێک لە شۆڕشی چواردەی تەمووز بوو. لە دوا ساڵەکانی ژیانمدا لە سلێمانی گیرام و ساڵێک زیندانی کرام و ساڵێک دوورخرامەوە و خرامە ژێر چاودێری. لە هەموو ئەم ساڵانەدا لەیادم نییە عیززیی برای خۆشەویستم دیبێ، تازەبوونەوەی یەکتری بینینمان لەبەغدا بوو.

من هەرچەند جاران بیرم باش بوو زۆرشتم لەیادبوو، زۆر ڕووداوی خۆم و برادەرانم لەیاد بوو، بەڵام لەم دواییەدا بەهۆی ئـەم نەخۆشییەی ئێستامەوە کە پێنج ساڵە بەدەستیەوە دەناڵێم، زۆرتری ئەو ڕووداوانەم لەبیرچوونەتەوە کە بەسەرمدا هاتوون و ناکەونەوە یادم. بۆیە زۆر ئەڵقەی پێوەندی خۆمم لەگەڵ عیززی لە ساڵانی یەکتری ناسینماندا لە سلێمانی و لە بەغدا پاش شۆڕشی ١٤ی تەمووز لەیاد نییە، ئەگەر بەهۆی خوێندنەوەی بابەتێکەوە نەبێ یا کەسێک نەیخاتەوە بیرم و بیرم بکەوێتەوە، ئەگینا وەک پێیاندا تێنەپەڕیم، وایە لام.

بەهەرحاڵ کە شۆڕشی ١٤ تەمووز ڕووی دا، ماڵی ئێمە هێشتا لە کەرکوک بوو، پاش ئەوە بە ساڵێک و بەهۆی مەترسی لە ئەنجامەکانی ڕووداوەکانی کەرکوکەوە، بەباشمان زانی بچینە بەغدا و چووین. بۆیە سەرەتای تازەکردنەوەی پێوەندی من و عیززی بۆ گەڕانەوەی ئەو لە سووریاوە دەگەڕێتەوە و بۆ کەوتنەکاری پێکەوەیی هەردووکمان لە



م. جەعفەر - د. کەمال فواد - حەمەی مەلا کەریم - د. عیزەدین - د. کەمال مەزهەر - عەبدوڵڵا زەنگەنە

بواری ڕۆژنامەنووسیدا کە لە ڕێگای ڕۆژنامەی شەهید کراوی (ئازادی)یەوە، کە ڕێگای دەرکردنی بە حیزبی شیوعی درابوو بەناوی هاوڕێی شەهید (نافیع یوونس) وەوە من و ئەو یەکەم و دووەم کەس بووین دەرکردنی ئەو ڕۆژنامەیەمان پێ سپێررا.

من لەو سەردەمەدا لە ئیسلاحی زەراعی کارم دەکرد. لەیادم نییە عیززی بەچییەوە خەریک بوو؛ بەڵام دیار بوو لە حیزبەوە زۆر نزیک بوو. وابزانم زیاتر سەرقاڵی ئەوە بوو بڕوا بۆ یەکیەتی سۆڤیەت بۆ خوێندنی دکتۆرا لە ئەدەبی کوردیدا. بۆیە من زیاتر بەکاری خۆئامادەکردنەوە بۆ دەرکردنی ڕۆژنامەی (ئازادی) خەریک بووم. لەگەڵ ئەوەیشدا عیززیش هەر بەکاری خۆئامادەکردن بۆ دەرکردنی ئازادییەوە خەریک بوو. زۆری پێ نەچوو عیززی چوو بۆ سۆڤیەت. ئیتر لەوکاتەوە پێوەندیمان بەیەکەوە هەر لەڕێگای نامەنووسینەوە بوو. ئەو لەوێ مایەوە تا خوێندنەکەی تەواوکرد و دکتۆراکەی وەرگرت، بەڵام ڕاستەوخۆ نەگەڕایەوە و ماوەیەک لە سووریا مایەوە، تا ئاڵوگۆڕەکانی پاش کودەتای سوپایی ١٩٦٣ دەرفەتی گەڕانەوەی بۆ ڕەخساند. وەک ئێستا دێتەوە یادم و ئەگەر بەهەڵە نەچووبم، عیززی لە ١٩٦٦ هاتەوە بۆ نیشتمان و بوو بە مامۆستا لە کۆلێژی ئەدەبیاتی بەغدا.

بەهاتنەوەی میانەیەکی پتەو لە نێوانماندا دەستی پێ کردەوە و دیارترین چالاکییەکانی ئەو ماوەی هەردووکمان لە بواری کارکردندا بوو بۆ پێکەوەنانی (یەکێتی نووسەرانی کورد)، پاش ئەو تەقەلا گەرم و گوڕەی کە لە کۆلێژی ئادابدا دەیدا بۆ پێگەیاندنی قوتابیانی کورد کە بۆ یەکەمجار لقی کوردی کرابووەوە لە ڕوویاندا لە کۆلێژی ئاداب.

لە کێشەی داکۆکیکردن لە یەکێتی نووسەرانی کورد و خەبات بۆ ڕێگرتن لە هەڵوەشاندنەوەی و تواندنەوەی ئەندامەکانیدا لە چوارچێوەی یەکێتی گشتی ئەدیبان و نووسەرانی عێراقدا، کە ئامرازێکی ڕوو هەڵماڵراوی ڕووتی سیاسەتی حکومەتی بەعس بوو لە بواری ئەدەب و ڕۆشنبیریدا، من و دکتۆر عیزەدین خراینە ژێر تەوژمێکی توندی چەوساندنەوە و چەرمەسەری.

لەو بوارەدا ڕۆژێکیان بەڕێوەبەری گشتی ئاسایش دکتۆر فاضل البراک، کە هەر لە مۆسکۆوە دکتۆر عیزەدینی باش دەناسی و دەبوو ڕێزی لەو ناسیاوییەی بگرتایە، ناردی بەدوای هەردووکماندا بۆ (چاوپێکەوتن) بچین بۆ لای بۆ ئاسایشی گشتی. کە چووینە لای، دەستی کرد بە قسە کردن بۆمان کە ناوەڕۆکی قسەکانی خاڵی نەبوون لە هەڕەشە و گوڕەشە. قسەکانی (دکتۆر فاضل) زیاتر ڕوویان لە دکتۆر عیزەدین بوو. لە چوارچێوەی قسەکانیدا دەستی برد بۆ چەکمەجەیەکی مێزەکەی بەردەمی و هەندێ فایلی دەرکێشایە دەرەوە و بە دکتۆر عیزەدینی وت: دەزانن ئەم فایلانە چییان تێدایە؟ و لەگەڵ ئەو ڕستەیەیدا دەستی برد بۆ ملی خۆی و لە دکتۆری پرسی: دەزانن ئەم فایلانە چییان تێدا نووسراوە؟ ئینجا وتی ئێمە ئەگەر بەپێی ئەم فایلانە مامەڵەمان لەگەڵ ئێوە بکردایە (دەستی هێنایەوە بە قوڕقوڕاچکەی خۆیدا)، دەبوو سەرتان ببڕن.

هەر پاش ئەو چوونەی من و دکتۆر بۆلای فاضل البراک بەچەند ڕۆژێک من گیرام و دوو هەفتە لە ئاسایشی گشتی تەوقیف بووم، ئەمە نموونەیەک بوو لەو کردارانەی حکومەتی بەعس لەگەڵ من و دکتۆر عیزەدین کردی لە تۆڵەی داکۆکی کردنمان لە مافی ئازادی ئەدیبان، لەوەدا کە ڕێکخراوێکی ئەدەبی سەربەخۆیان هەبێ.

دکتۆر عیزەدین سەربەدەرەوەبووترین ئەدیبی کوردە، چ لە خزمەتکردنی ئەدەبی کوردی و چ لە پێگەیاندنی ئەدیبانی کورد، چ بەتێکۆشانی لە بواری دامەزراندنی یەکێتی نوسەرانی کورد و چ لە سەرۆکایەتیکردنی ئەو یەکێتییەدا و چ بە مامۆستایی لە کۆلیژی ئادابدا و چ لە بەرەوڕووبوونەوەی کاربەدەستانی حکومەتی ئەو ڕۆژانەدا بۆ هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی، بۆ دەستگرتن بەسەر یەکێتیدا و، کردنی بە ئامرازێکی هەڵخەڵەتاندنی گەلی کورد و ئەدیبانی کورد، دکتۆر عیزەدین کە بەتەواوی دڵنیابوو لە پاشگەزبوونەوەی ڕژێم لە هەموو ئەو گفتانەی دابوونی بە ئەدیبانی کورد بۆ هێشتنەوەی یەکێتییەکەیان، ئیتر نەیوست وەک لایەک بەشداربێ لەو گاڵتەجاڕی و ساختەچییەتییانەدا کە کاربەدەستانی میری دەیانکرد لە بواری هەڵخەڵەتاندنی ئەدیبانی کورددا، ئیتر کە زانی شەڕێکی بێ سوود دەکا لەم پێناوەدا، دەستی تەواوی لە یەکێتی ئەدیبانی عێراقیش و کوردیش کێشایەوە و خۆی تەرخان کرد بۆ کارکردن لەو بوارانەی تری خزمەت بە ئەدەبی کوردیدا، کە ڕێگای لەبەردەمدا نەگیرابوو تیایاندا. وەک پێشتریش ئاماژەم بۆ کرد من لەم نەخۆشییە درێژخایەنەمدا دەتوانم بڵێم ٨٠ — ٩٠ ٪ی ئەو شتانەم لەبیرچووەتەوە کە لەیادمدابوون. بۆیە پێم ناکرێ ئەو بیرەوەرییە خۆشانە لەگەڵ د. عیزەدیندا هەمبوون بهێنمەوە یاد و بیانخەمە سەرکاغەز، بۆیە ئەم نووسینە کەم و کورتە لەگەڵ داوای لێبووردندا بەوە دوایی دەهێنم کە بنووسم: د. عیزەدین یەکێکە لە ڕیزی پێشەوەی ئەو ڕۆشنبیرانەی گەلی کورد، کە مایەی شانازی پێوەکردنی سەرجەمی ئەم گەلەن لەم سەدەیەدا، گەر لەمەندەیش زیاتر نەبێ.

دکتۆر عیزەدین مرۆیەکی خاوەن بیروباوەڕی خەباتگێڕانە و نیشتمانپەروەرانەی دیاری نەتەوەی کورد و سەرانسەری کوردستانە و یەکێکە لە زانا گەورە و هەڵکەوتووەکانی بواری ئەدەبی کورد و بیری کوردی و هەمیشە وەک چرایەکی گەش تیشک دەداتەوە.



# پ. د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ ئینسکلۆپیدیای ئەدەبی کوردی

د. هەڤاڵ ئەبوبەکر

ئەو، ئایین و ئایدۆلۆژیاو ئەندێشەو ئایدیالیستیی و ماتریاڵییەتی ئاوێزانکرد، ئەزموون و ئەکادیمیبوونی پێکەوە گرێدا، جوگرافیای داخراوی نیشتمانی کردەوەو کوردستان و بەغداو شام و مۆسکۆو ستۆکهۆڵمی بەیەکەوە بەستەوە، لە حوجرەکەی دێلێژەوە گەیشتە بەردەمی کرەملین، زمانی کوردیی و عەرەبیی و فارسیی و تورکیی و ڕوسیی، دیالێکتەکانی تری زمانەکەمانی بەیەکەوە کۆکردەوە، لەسەرەتایەکی نزیکەوە لەگەڵ کتێب و بیری نوێی ئەو سەردەمەو ڕاڤەی قورئانی پیرۆزو کاپیتاڵیزمەکەی مارکسدا تێکەڵبوو، ئەزموونی وەک بەرهەمی بڵاوکراوە لە ١٩٥٥دا بەفەرهەنگۆکێک بۆ قوتابیانی کورددەستپێکرد، دواتر (خانی) هێنایەوە ناو دیوانی ئەدەبیاتی کوردیی و ڕۆحێکی نوێی بە ئەدەبیاتی کرمانجی ژووروی ئەنفالکراودا کردەوە، بە زۆربەی قۆناغەکانی ئەدەبیاتی نیشتماندا تێپەڕی، جارێکی تر گیرسایەوە، ئەمجارەیان لەسەر (گۆران)، لەسەر ئەدەبیاتی نوێی کوردیی و شێوەزارەکەی سلێمانی، ئەدەبیاتی دێرینی بە ئەدەبیاتی نوێوە بەستەوە، ئەو کوڕی ڕۆژگارێک بوو کە دەبوو تەنها پشت بەخۆت و گەڕانی خۆت و پشکنین و ماندووبوونی خۆت ببەستی، بۆیە ئەو نزیکەی هەشتا بەرهەمەی هەیەتی جگە لەو هەموو توێژینەوەو وتارو سەرپەرشتکردن و هەڵسەنگاندن و بەشدارییە کارایانەی، هەموو دەستچنی ڕەسەنایەتیی خۆیەتی، بۆن و بەرامەو تایبەتمەندێتی توێژەرێکی کوردیان پێوەیە، بەرهەمەکانیم لە قۆناغی سەرەتایدا ناسی لە ساڵی ١٩٨٨یشەوە خۆیم ناسی، ئەو نە لە خوێندنەوە ماندوو دەبێت و نە واز لە نووسینیش دەهێنێت، ئەو تەنها بە مێژووی ئەدەب و تیۆرە ئەدەبییەکان و ڕەخنەی ئەدەبیی زانا نییە، بەڵکو بەتوانایشە لە زانینی سەرچاوەو هۆکارو لێکەوتەی دەقەکان و هۆنەرەکانیان، دانایە بە

هارمۆنییەتی سروشتیانەی ئەفسانەو ئایین و ئایدۆلۆژیاو ئەدەب، ئاشنایە بەهەموو ئەدەبیاتی کوردیی کوردستانی مەزن و هەموو ئەدەبیاتی کوردیی لەهەر شوێنێکی دنیادا بووبێت، بیری تیژو زەینی ڕوون و دنیابینییەکی تایبەتیانەی خۆی هەیە، شایەتحاڵێکی گەورەی ڕەوتی ئەدەبیاتی کوردیی و گەشەی ئەدەبیاتی کوردیی و سروشتی ئەدەبیاتی کوردییە، ئەم زانای دووچەرخە (پرۆفیسۆر دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ)ە، کە وەک ئینسکلۆپیدیای ئەدەبیی کوردیی دەردەکەوێت و سادەیانە دەبینیت و ئاساییانە دەدوێت، بەڵام گەوهەر لە زەین و لە ئاوەزو لە ئەزموون و لە زانیارییەکانمان دەدات.

ئەو یەکەم کوردبوو کە لەساڵی ١٩٥٨دا ناسنامەی ڕۆژنامەنووسیی لە عیراقدا هەڵگرت و بەردەوام تا ئەمڕۆ، لە مێدیاو ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا دەنووسێت.

نووسینەکانی تەنها گوزارشت نین لە سەروەرییەکانی ڕابردوو، بەڵکو زۆربەیان گوزارشتن لە ئەمڕۆ، ئەمڕۆیەک کە زیاد لە هەر ڕۆژێکی تر زمان و ئەدەبی کوردیمان لە ژێر هەڕەشەی خراپ بەکارهێنان و خراپ نووسین و خراپ بڵاوکردنەوەو خراپ خوێندنەوەدایە. ئەم زاتە بەڕێزە وەک دارێکی بەردار، هەمیشە بەرو بەرهەم و سێبەری هەیە، لەگەڵ ئەوەی ڕۆژگارو ڕێبوارو هاوکار بەردی زۆریان لێداوە، بەڵام تادێ گەڵاکانی زۆرترو سەوزترو سێبەری فراوانترو بەرهەمەکانی شیرینتر دەبن، ئەو تەنها لە ڕۆژی سەرکەوتنەکاندا خۆی بە خاوەنی خەباتی چینایەتیی نەزانیوە، بەڵکو لە ڕۆژگاری نەهامەتیشدا مەردانەو ڕاستگۆیانە لەگەڵ بیرو بڕواو باوەڕەکانی خۆیدا ماوەتەوە، بەبێ ئەوەی بیانکاتە کەرەستەی ململانێ و شکاندنی ئەوانی تر، ڕێز لە هەموو بیرو باوەڕێک دەگرێت، لایەنە گەشەکانی هەموویانی وەکو یەک پێقبوڵە، زۆرجار ماڵەکەیانم وەک خانەقاکەی مەولانا خالیدی نەقشبەندیی یان کوچەیەکی مزگەوتێک بینیوە، بەتایبەتی ئەو کاتانەی بانگەهەقەکەی مزگەوتی حەمەساڵح بۆسکانیی دەگاتە گوێم و بەرەو قیبلەگای ئەوینی خودایی سەر دەخەمە سەر سوچێکی ماڵەکەیان، ئیتر لەگەڵ سڵاودانەوەدا، سڵاوی ئەو دەبیستم و وتەو ئەزموون و بیرو ڕفتارو کەراماتە جوانەکانی کاک ئەحمەدی شێخ و مەولانا خالیدوشێخ عەبدولقادری گەیلانیی و مەلا مستەفای سەفوەت و حاجی مەلا ڕەسولی دێلێژەو مەلا ناودارەکانی کوردستان و خۆیم بۆ دەگێڕێتەوە.

ماڵی ئەوان ژوانێکی جوانی ئەوینێکی ڕاستەقینەیە، کە لەسەرەتای ئەو عەشقەوە تا ئەمڕۆ وەک پەروانە بەدەوری شەمعدانی مۆمی داگیرساوی ڕووناکخاندا دەخولێتەوە، ئەوەی گرنگە هەرگیز ناسوتێت و بەردەوام ڕۆشن دەبێتەوە، ئەو شێرەژنەی کە لەخۆی زیاتر بەبەرهەمەکانییەوە ماندوو دەبێت، جگە لە خەندەو خۆشیی‌و خۆشەویستیی و خۆنەویستیی، شتێکی ترم لێنەدیوە.

ئەو دەڵێت یەکەم کتێبی مارکسم لە دەستی باوکمەوە وەرگرتووە، ئەو هەمیشە هانیدەدام بە خوێندنەوەو گەڕانی خۆم بگەمە ئەنجام، هەمیشە ئەوانی تر بخوێنمەوە ئیتر هەرچی بن و خاوەنی هەر بیرێک بن.

ئەو بڕوای بە تیۆری گەشەکردن و پوکانەوەیش هەیە، بۆیە هەمیشە گەشبینانە دنیا دەبینێت و لە کونجێکی تاریکی مێژوودا بە جێنەماوە، بەڵکو تا ئەمڕۆ، لەگەڵ نەوەکانی نیشتماندا خوێندکارانە دەخوێنێت و مامۆستایانە دەرس دەڵێت و هاوڕێیانە ڕەفتار دەکات و پێشمەرگانە خۆی بە هەولێرو ئامەدو مەهاباد و قامیشلیدا دەکات.

گوزەرکردن بە بەرماڵەکەی ئەواندا، گوزەرکردنە بەناو باخێکی پڕ گوڵی جوانی ڕازاوەی بۆنخۆشدا، ئەگەر لە دەرگاشیان نەدەیت، ئەوا هەر جوانی گوڵەکان و بەرامەی خۆشیان لەگەڵ خۆتدا دەبەیت.



# د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، پیاوێك لە كتێب



د. ڕەئوف عوسمان

د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، یەکێکە لە زاناکانی ئەم سەدەیە لە بواری ئەدەب و زمانی کوردیدا، بەرهەمە فرە و ناوازەکانی شایەتی ئەو ڕاستییەمان بۆ دەدەن، کە هەوڵ و تەقەلایەکی بە بڕشتی داوە بۆ خزمەت و بوژاندنەوەی ئەدەبی کوردی و بەدەرخستنی لایەنە نەزانراو و گوماناویەکانی، نەک هەر ئەمە بەتەنیا، بەڵکو هەمیشە لە بەرەی میللەتا بووە و بە وتار و هەوڵە فرە لایەنەکانی خواست و ئاواتەکانی میللەتی کوردی بەرجەستە کردووە.

مەرجەعیاتی هزر و بۆچوونە سیاسییەکانی لە فەلسەفە و بیری مارکسیەتەوە سەرچاوەی هەڵگرتووە، دیارە لە گەلێ بواری نووسین و توێژینەوە و بۆچوونەکانیدا، سێبەری ئەم هزرە ڕەنگی داوەتەوە و تەنانەت بەرگری شێلگیرانەشی بە نووسین و هەڵوێستی ڕۆژانە لێکردووە.

ئەم بەرگریکردنە ئایدیولۆجییەی پرۆفیسۆر، لە فیکری چەپ زۆرجار دووچاری لەسەر نووسین و پەرچە فیکری دژ بۆتەوە، دیارە د. عیزەدینیش حەپولکی کەسی نەداوە و هێندەی بۆی کرابێت، چۆتە سەنگەری بەرگری و وەڵامدانەوەوە، بەتایبەتی لە ڕۆژگاری شەڕی ساردی نێوان حیزب و لایەن و ڕێکخراوە کوردییەکاندا، ئەو شەڕی ساردە، بە داخێکی سەختەوە شۆڕبووبووەوە بۆ هەموو کون و قوژبنەکانی ژیانی سیاسی و زانستی و کۆمەڵایەتی و تەنانەت ئەدەبیش، کە ئاکامێکی سەختی بەجێهێشت لەسەر هەست و نەستی میللەتە ساویلکە و نەخوێندەوارەکە، نەک هەر ئەمە بەتەنیا، بەڵکو مێژوویەکی لێوانلێو لە خۆخۆری و دژیەک بوونیشی تۆمار کرد، ئەگەر شەڕی ساردی نێوان حیزبە کوردیەکان میللەتی تووشی دردۆنگی و گەوجاندن کردبێت، دیارە دەسپێشخەریشی کردووە بۆ ئامادەکردنی فەزای شەڕی گەرمی نێوان ئەم حیزبانە، کە تا هەنووکەش ئاسەوارەکانی درێژەی هەیە، دیارە لە کەش و هەوایەکی لەم جۆرەدا، میللەتەکەمان جامی لێوان لێوی غەشیمانەی نۆشیوە و سەری دڕدۆنگی و نەگبەتی پێ گەرم کردووە.

یەکێک لەو کۆڵەکانەی کە کەسێتی ئەدەبی و ڕووناکبیری ئەم زانایەی لەسەر وەستاوە، ئەم زیرەکی و بەهرە خۆڕسکەیەتی، کە لە نووسینەکانیا بە زەقی ڕەنگی داوەتەوە، شیکردنەوە و تاووتوێکردنی بابەتەکان و پشتبەستن بەو بەهرە خودییەی کە وەک هێزێکی خۆڕسک دەدرەوشێتەوە، بەرهەمەکانی




کتێبخانەکەی د. عیزەدین

خستۆتە ئاستێکی باڵاوە و هەمیشە جێ متمانەی زانکۆکان بووە، ئەمە جگە لەو «ذاکرة» بیرەوەرییە تیژەی کە وەک کامێرای دەستی هونەرمەندێک هیچی لێ ون نابێت و هەموو کەلێن و قوژبنەکان کێومالّ دەکات و دەیخاتە خزمەتی توێژینەوەکانیەوە، دیارە بیرەوەری تیژ و زیرەکی درەوشاوەی د. عیزەدین، دوو بەهرەی خۆڕسکی خوداییین و د. عیزەدینیش لەپەنایاندا بەهرەمەند بووە. یەکێک لە مەرجەعیاتی کەسایەتی زانستی د. عیزەدین، خوێندنی مزگەوتە کە لە خزمەتی باوکیا سەرچاوەی گرتووە، ئەم نەزمی خوێندنە و تێکەڵاوی لەگەڵ فەزای مەلا و مزگەوتدا، گوڕێکی تری داوەتە ئاستی نەک عەرەبی زانینەکەی بەتەنیا، بەڵکو شارەزایی فرەلایەنی پێ بەخشراوە لە بواری فەزای زانستە ئاینییەکان و بەستنەوەیان بە گەوهەری هەندێک لە دیراسات و نووسینەکانیەوە، سوودبینینی فرەی د. عیزەدین لە بوارەکانی نحو، بلاغة، منطق، یارمەتی تیژکردنەوەی تواناکانی داوە، بۆ بەکارهێنانی جەدەل و حیوار و وردەکاری و دنیا بینی زانستانە، ئەم خەسڵەتانەی مەڕ د. عیزەدین، حسین مروة__م دێنێتەوە بیر ئەم تەمەنی درێژبێت! لەپەنای ئەم ڕووناکبیرییە ئاینیەدا، د. عیزەدین سوودی گەورەی لە فەلسەفە و ڕووناکبیریی و ئایدیۆلۆجیای مارکسی بینیوە، واتە دوو ئاو لە جامێ هەریەک لە ڕەنگێ، قاڵبوونی پرۆفیسۆر لەم دوو فەلسەفەیەدا هێز و گوڕ و توانایەکی ئەوتۆی پێ بەخشیوە، کە بەرەو مەوسوعیەت بڕوا لە بواری ئەدەب و زمانی کوردیدا، ئەم مەوسوعیەتە لەم سەردەمەدا بەتەنیا لای مامۆستا مەسعود محەمەد و د. عیزەدین بەدی دەکرێت و کتێبەکانیشیان گەواهی بۆچوونەکەمە. سوودبینینی عەرەبی زانینەکەی د. عیزەدین بایەخێکی فرەی هەبووە بۆ دەوڵەمەندکردنی دنیای ئەدەبی کوردی، وەرگێڕانی دیوانی گۆران بۆ زمانی عەرەبی، ناساندنی گۆرانە بە جیهانێکی فراوانی خەڵک و بردنە دەرەوەی عەبقەریەتی شاعیرێکی





کوردە لە ناوچەیەتییەوە بەرەو بە جیهانیبوون، جگە لەمەشیان لە کتێبی (بقلم کردی)دا کە بە زمانی عەرەبی دەرچووە، دەبینین ئەم زاتە چ هەوڵ و تەقەلایەکی داوە لەنێو ڕۆژنامە و گۆڤارە عەرەبی و عێراقییەکاندا، بۆ ناسینی میللەتی کورد و بەرگری شێلگیرانە لە دۆزە ڕەواکەی و دڕپێدانی ئەو تەمی گومانە لای عەرەبە شۆڤێنییەکان لەسەر مەسەلەی کورد، ئەمە جگە لە بەرگری شێلگیرانە لە هزر و بیری چەپ و پێشکەوتنخواز.

ئەو کاتەی کە دکتۆر عیزەدین بووە سەرپەرشتیاری نووسینەوەی نامەی ماجستێرەکەم (الشیخ معروف النودهی بلاغیا) گەلێک دڵخۆش بووم، چونکە دەمزانی سوودی فرە دەبینم لە توانا و تێبینییە زانستیەکانی.

با ئەوەش نەبوێرم کە هەندێکجار هەردووکمان لەسەر بابەتێکی پڕ گرێ و گۆڵی بەلاغە ماندوو دەبووین و گرێکانمان بۆ نەدەکرایەوە، ڕای دەسپاردم بۆلای مەلایەکی شارەزای مزگەوت، لە ئاست زانای گەورە عەبدولکەریم مودەڕیسدا کە ئەوەشم دەس نەدەکەوت!! ئەوەی کە هەردووکمانی ماندوو کرد، بابەتی (الفصل و الوصل) بوو، چونکە بەندە لە زانکۆدا نەمخوێندبوو، تەنانەت زانا ئێرانییەکان دەڵێن (اساسی بلاغة فصل و وصلست)، ئەمە جگە لەوەی کە زانستی بەلاغەی عەرەبی خۆی لە خۆیدا ئێجگار قورسە، چونکە پەیوەندی بە ئەزمکردن و شارەزایی تەواو هەیە لە هەموو زانستە عەرەبییەکانی مەڕ زمان و نحو، صرف، عروض، ادب... هتد، با ئەوەش نەبوێرم کە زاناکانی بەلاغەی وەک خەتیبی قەزوێنی و سەکاکی و تەفتازانی و هەموو ئەوانەی کە لە (شروح التلخیص)یان کۆڵیوەتەوە، لەسەر گەلێ شت ناکۆکن و تەرجیحاتی جیا جیایان هەیە! دیارە گەیشتن بە ئەنجامیکی دڵنیاکەر لەنێو ئەم بۆچوونانەدا، هەوڵ و تەقەلا و ماندووبوونی دەوێ، بەندە نازانم دەستنیشانی کامە کتێبی بکەم بۆ ئەوەی تۆزێک لەسەری بووەستم، چونکە دکتۆر پتر لە سەد کتێبی بەرهەمهێناوە و بوارەکانی جیا جیان.

بەشی یەکەمی مێژووی ئەدەبی کوردیەکەی لێوان لێوە لە زانیاری و دەستنیشانکردنی سەرچاوەی مەڕ ئەحمەدی خانی، نازانم دکتۆر ئەم هەموو سەرچاوەیەی مەڕ ئەحمەدی خانی لە کوێوە هێناوە و ئەم کانی بیرەوەرییەی بۆ ئەوەندە پاراو و چاو قرژاڵییە؟! د. عیزەدین لەم بەرهەمەیدا پرۆگرامێکی جیاوازی هەیە، لە مێژووی ئەدەبە کوردیەکانی تر، ئەگەر مێژووی ئەدەبە کوردیەکانی تر زانیارییان هەڵڕشتبێت بەبێ دەستنیشانکردنی سەرچاوە، ئەوا د. عیزەدین پشتی بە دۆکیۆمێنت و دەستنیشانکردنی سەرچاوە بەستووە و لەو نێوانەوە زانیارییەکان چێدەکات، جگە لەمەشیان د. عیزەدین هەوڵی ئەوەی داوە کە لەسەر خشتەی بابەت و کات زانیارییە جۆربەجۆرەکان بەدەرخات، خۆزگە لەکاتی دیارکراودا ئەم پرۆژە گرنگ و پڕ بایەخەی تەواو دەکرد، حەزدەکەم ئەوەش بڵێم کە د. عیزەدین هەر بەدەستنیشانکردنی سەرچاوەکان دانەکاساوە، بەڵکو لە نێوان سەرچاوەکانەوە شیکردنەوە و مشت وماڵی بابەتەکەی کردووە بەپشتبەستن بە جەدەل و لۆژێکێکی تۆکمەی سەلمێنەر، هەرچەندە هەندێک بابەت تا ئێستا ئەشێت خوێندنەوەی جیاوازی بۆ بکرێت، چونکە کەس سەد دەرسەد نەقشیی نەهێناوە، بەتایبەت لە ڕاست و دروستی مەرجەعیاتی ئەدەبی کوردی و مێژووە پڕ لە هەوراز و نشێوەکەی.

هیوادارم بەرگەکانی تری ئەم مێژووی ئەدەبە بە ئەنجام بگەیەنێت و لەو ڕێگایەوە بکرێتە سەرچاوەیەکی گەش بۆ خەڵک و بەتایبەت قوتابیەکانی خوێندنی باڵا بۆ توێژەرەوەکان.

دەبوو دەسەڵاتی کوردی تیم و ستافی تایبەت و پسپۆڕ تەرخان کات، بۆ زانای وەک د. عیزەدین و د. کەمال مەزهەرو د. مستەفا زەڵمی بۆ تەواوکردن و بە ئەنجام گەیاندنی پرۆژەی نووسین و بەرهەمەکانیان، ئەم سێ گەوهەرە دانسقەیە، چەند موڵکی خۆیانن زۆر لەوە پتر موڵکی میللەتی کوردن و نابێت هەروا بەتەنیا لەناو قەدی ڕێگادا جێ بهێڵرێن و پرۆژەکانیان بەبێ نەوایی سەر بنێنەوە، گەرەکە یارمەتیدەر و پاکنووسکار و تایپێست و خەڵکی شارەزایان بۆ تەرخان بکرێت، بە چ حەق و یاسایەک بەرپرسێکی نیمچە خوێندەوار، چەندان پاسەوان و شۆفێر و ئۆتۆمبێل بەدەور و خولیەوە بن، بەڵام زانایەکی گەورەی وەک د. عیزەدین یارمەتیدەر و ڕاوێژکاری تایبەتی نەبێت؟! دیارە نرخی زێڕ لای زەڕنگەرە! لە وڵاتانی خواپێداودا خەڵکی وەک د. عیزەدین و د. کەمال مەزهەر سەرپەرشتیار و ڕاوێژکاری فرەیان هەیە بۆ چێکردنی بەرهەمەکانیان و دەوڵەت نووسینگە و شوێنی تایبەتییان بۆ تەرخان کردوون بۆ ئەوەی کە بە شێوەیەکی ڕێک و پێک دیداریان لەگەڵدا بکرێت، کتێبخانەکانی ئەم زانایانە کراونەتە مەڵبەندی خوێندکاری باڵا و هەمیشە وەک پوورەی هەنگ جمەیان دێت. چەند جارێک بەندە و د. عیزەدین بانگهێشت کراوین بۆ میهرەجانی جەواهیری لە بەغدا، ئەدیب و ڕووناکبیرە عەرەبەکان ئێجگار سەرسام بوون بە گێڕانەوەی بیرەوەرییەکانی لە مەڕ جەواهیری، کە بەو زمانە عەرەبییە پاراوەی دەیگێڕایەوە تەنانەت زۆرجار لە گێڕانەوەکانیا لاسایی فۆنەتیکی گۆکردنی هەندێک پیتی

له بیرمابوو که جەواهیری له خوێندنەوەی شیعرەکانیا دەری دەبڕی و ئەدیبە عەرەبەکان ئێرەییان دەبرد بەو بیر تیژییەی د. عیزەدین. نابێت ئەوە فەرامۆش کرێت که بەشێکی فره له مامۆستاکانی کۆلێژی زمان له زانکۆکانی کوردستان، خوێندکاری ئەو بوون و لەوەوە بەهرەیان وەرگرتووە.
ئەگەر پلە و ئاستی زانستانەی پرۆفیسۆرییەکەی د. عیزەدین بەراورد بکرێت لەگەڵ هەندێک له پرۆفیسۆرەکانی ئێستای زمان و ئەدەبی کوردی، لەگەڵ ڕێز و حورمەتم بۆیان- جیاوازییەکە ئێجگار فراوان و تووڵانیە، واتە بەهرە و توانا و زیرەکی د. عیزەدین لەگەڵ خۆماندووکردن و خۆتەرخانکردنی سەرومڕ بۆ دنیای ئەدەبی کوردی، ئەو خاڵە ڕووناک و دیارانەن به تەختی تەوێڵی بەرهەمەکانیەوە ئەبریسکێنەوە.
جارێک لەسەر هەڵسەنگاندن و بەراوردکردنی نێوان هەردوو شاعیری گەورە، مەولەوی و ئەحمەدی خانی، که لەنامەی دکتۆراکەی د. عیزەدین دا هاتبوو (الواقعیة فی الادب الکردی) چەند سەرنج و توێژینەوەیەکم له ڕۆژنامەی عێراقی ژمارە (٢١٨٢، له ٤ / ٤ / ١٩٨٣) بە عەرەبی نووسی، لەژێر ناوی (عالم مولوی الرومانسی والواقعیة المطلوبة)، دیارە بۆچوونەکانمان بە دژ دەوەستانەوە لەمەڕ چەمکی قوتابخانەی ڕیالیزم و جۆرەکانی و هەندێک تەئویلی هزری مارکسی لەمەڕ ئەدەب و چەمکەکانی، بڕیار بوو بەشی دووەمی لێکۆڵینەوەکەش له ئەڵقەیەکی تردا بڵاوکەمەوە، بەڵام هەتا ئێستاکە بەشی دووەمی لێکۆڵینەوەکەم داخستووە، چونکە دڵنیابووم لەوەی که هەندێک بە بڵاوکردنەوەی شاگەشکە دەبوون و ترش و خوێی نەیارانەیان پێوە دەکرد، دیارە بەو هەڵوێستەیان خواستە زانستی و بابەتیەکەی منیان له دنیای ڕق و مەبەستە شەخسییەکان تێکەڵ دەکرد و بێ ویست و ئیرادەی خۆم دەخرامە نێوان دوو کەوانەی نەویستراوەوە، هەتا هەنووکە د. عیزەدین دەڵێت: (من شتم لەدڵ دەردەچێت، بەڵام لەمێشکمدا دەمێنێتەوە)، دوای ئەوەندە ساڵ دەڵێم دەشێت مامۆستا بۆچوونی جیاوازی خوێندکارەکەی قبووڵ کات، چونکە هەر جیاوازییەکانە، جووڵانەوەی هزر و مەعریفە بەرەوپێش دەبات، با ئەوەشم لەبیرنەچێت که هۆی سەرەکی چارس کردنی د. عیزەدین ئەوەبوو، که لەو دەورانەدا هەندێک نەیاری د. عیزەدین نان و پیازیان بە نووسینەکەمەوە دەخوارد!
وارێکەوت که له کاتی یەکێک له فێستیڤاڵە ئەدەبیەکانی بنکەی گەلاوێژدا، د. عیزەدین له تاران نەشتەرگەری دڵی بۆ کرا، بەندە- وەک سەرۆکی بنکە- بەناوی فێستیڤاڵەوە بروسکەی خەمباری و دوعای چاکبوونەوەم بۆ ناردوو بە (عمید الادب الکردي) ناوزەدم کرد، دیارە تا ئێستا بەندە لەسەر هەمان ڕام، ئەگەر (عەمید) بە واتای کۆڵەکە بێت ئەوا د. عیزەدین له بواری ئەدەبدا پتر له سەد کتێبی داناوە و دەیان مامۆستای زانکۆ ئەو سەرپەرشتی کردوون، ئەمە جگە لەوەی که خاوەنی بڕوانامەی (ناووکە) که باڵاترین بڕوانامەی وڵاتی ڕووسیایە، با ئەوەشم لەیاد نەچێت که (عمید) بەواتای خەمخواریش هاتووە له زمانی عەرەبیدا، ئەبو نەواس دەڵێت:

**یا ایها المعمود      قد شفك الصدود**




خۆ ئەگەر بەم واتایەشی مامەڵە بکەین، دەشێت د. عیزەدین یەکێک بێت له خەمخۆرەکانی دنیای ئەدەب و زمان. کتێبی ئەدەبی بەراوردەکەی که له زمانی ڕووسییەوە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، پەنجەرەیەکی گەورە و ڕووناک دەخاتە سەر پشت بۆ خوێنەری کورد، چونکە کتێبخانەی کوردی لەم بوارەدا ئێجگار دەسکورت و پەژمردەیە، له نێوان ئەو کتێبەوە کۆمەڵێک زانیاری تازە و وردمان لەمەڕ دنیای ڕۆمان و داستان له ئەدەبی خۆرهەڵاتدا دەست دەکەوێت،

ئەمە جگە لە پیشاندانی تیۆرە جیاوازەکانی ئەدەبی بەراورد و دنیا فراوانەکەی، ئەو هەوڵەی د. عیزەدین ئاشنامان دەکات بە فەزای داستانە خۆرهەڵاتییەکان و ناوەڕۆکە پڕ لە جیهانبینییەکانیان، لە نێوان ئەو وەرگێڕانەوە هەندێک بەرهەمی ناوکۆیی چەند نەتەوەیەک دەبینین بەتایبەتی لە بواری داستاندا.



بیرەوەرییەکانی د. عیزەدین، پانۆرامایەکی ژیانی تایبەتی خۆیەتی، بەڵام ئەم ژیانە بارگاوییە بە هەموو ئەو کێشە کۆمەڵایەتی و سیاسییەی کە لە دەورانی ژیانیا ڕوویانداوە، ئەو پانتاییەی کە شانۆی بیرەوەرییەکانی تیا نمایشدەکات، فراوانە و خوێنەری کورد لە نێوان ئەو بیرەوەرییانەوە گەلێ زانیاری فرەلایەنی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی میللەتی کورد هەڵدەگوزێ و لەو نێوانەوە دەتوانێت ئاوڕێکی خێرا لەو بارودۆخ و نێوەندە بداتەوە و ئاستی هۆشیاری کاراکتەرە سیاسی و ئەدەبیەکان هەڵسەنگێنێ، تێکەڵاوی د. عیزەدین جارێک لەگەڵ ڕەشە خەڵکەکان و جارێک لەگەڵ کەسایەتییە ئەدەبی و سیاسیەکانی عێراق و سوریا و ئوردندا، هێندەی تر ئاسۆی دنیابینی فراوان کردووە و حەقیقەتی کۆمەڵگەی خۆرهەڵاتی لەبەردەمدا واڵا کردووە.

هەڵگوزینی مەعریفە و ڕووناکبیری و ئەدەب لە زمانی ڕوسی و عەرەبی و فارسییەوە، هۆکارێکی تری گەورە و بەرچاوە بۆ دەوڵەمەندکردنی دنیای هزر و بەهرەی د. عیزەدین.

د. عیزەدین جگە لە بواری دیراسات و توێژینەوە، هەنگاوی بەرەو داهێنان ناوە لە بواری شیعر و کورتە چیرۆکدا، بەڵام لەم بوارەدا هەنگاوەکانی گورج و درێژ نین و بەمە نەناسراوە.

د. عیزەدین لەبواری ڕۆژنامەگەری ئاشکرا و نهێنیدا ڕۆڵی دیار و بەرچاوی هەیە، بە هەردوو زمانی عەرەبی و کوردی ئەسپی خۆی تاوداوە و ئەوەندەی بۆی لوابێت ڕۆژنامەگەری وەک چەکێکی بیر و ئایدیۆلۆژی دەستە و یەخە، بەرامبەر ڕژێمە یەک لەدوای یەکەکان بەکار بردووە، تەنانەت زۆرجار ئەم چەکەشی بەرامبەر نەیارە ئایدیۆلۆژییەکانی بەکاربردووە و سەرکۆنەی کردوون.

کتێبی زمانی یەکگرتووەکەی، یەکێکە لەو بەرهەمە تێر و پڕ و نەوازانەی کە بۆتە نەخشە ڕێگایەکی ڕوناک و بێ گرێ، بۆ دروستبوونی زمانی یەکگرتوو و ستانداردی کوردی، کە تا هەنووکە خەوێکە و دەسەڵاتی کوردی دەیتارێنێ و خۆی لێ دەدزێتەوە، لەو کتێبەدا گیانێکی مشوور خۆر و دڵسۆز و بەئەمەک دەدرەوشێتەوە، لەمەڕ داهاتووی زمانی کوردیدا، کە پاراستنەکەی ئەرکێکی نەتەوەیی و شارستانی هەموو تاکێکی کوردە، جێی خۆیەتی لەم بوارەدا ئاماژە بۆ دیمەنێکی تراژیدی دڵتەزێن بکەم، کە کۆمەڵێک منداڵی قوتابخانە لە ناوچەی بەردەڕەش، مانی ئەوەیان گرتبوو کە مامۆستاکانیان بەشەق و زللە دەیانەوێت شێوەزاری کرمانجی سەروویان بەسەردا بسەپێنن و شێوازی کرمانجی خوارووییان لێ قەدەغە بکەن، ئەم دیمەنە تراژیدییە بە دەنگ و ڕەنگ،

عیزەدین مستەفا رەسوڵ



تەلەفزیۆنی nrt پەخشی کرد. دیارە د. عیزەدین بەر لە نزیکەی سی ساڵ وەڵامی ئەم ناحەقییەی داوەتەوە و داوای زمانی یەکگرتووی کردووە، فێختەی فەیلەسوفی ئەڵمانی لە وتاری (خطابات الی الشعب الالمانی) دەڵێت: ناڵاندنی گەلی ئەڵمانی لەژێر چەمکەی ڕاستەوخۆی داگیرکەردا، بەقەدەر ئەوە سەخت نییە، کە خوێندکارەکانمان بە زمانی زگماکی یەکگرتووی خۆیان نەخوێنن.

د. عیزەدین بە هەوڵ و کۆششی خودی خۆی شێوەزاری کرمانجی سەرو بە لک و پۆپەکانیەوە فێربووە و توانیوێتی لەم ڕێگایەوە کتێبە نەوازەکانی ئەحمەدی خانی بنووسێتەوە، دیارە لە ڕێگای ئەم کتێبەوە بڕوانامەی ناوکی بە دەست هێناوە، کە شانازییەکی زانستانەیە بۆ میللەتەکەمان، دیارە د. کەمال مەزهەریش هەمان بڕوانامەی هێناوە، کە باڵاترین بڕوانامەی زانستە لە ڕوسیادا.

د. عیزەدین لەگەڵ داکشانی تەمەنیشدا، ئامادەگییەکی بەرچاوی هەبووە لە بۆنە نەتەوەیی و نیشتمانی و ئەدەبییەکاندا، چ وەک جەستە، چ وەک وتار و لێکۆڵینەوە، ئەم ئامادەگییەی لە بۆنەکاندا، خۆشی و هێزێکی داوە بە کۆڕ و کۆبوونەوەکان.

لە دوای ڕزگارکردنی خانەقین، بۆ یەکەمینجار بنکەی گەلاوێژ، چالاکییەکی وتار خوێندنەوەمان بردە ئەم شارە، د. عیزەدین بەر لە هەموومان بەدڵخۆشییەوە داوەتنامەکەی قبووڵ کرد و بە ئەرکێکی نەتەوەیی لەقەڵەمدا، تەنانەت وتارێکی جوانیشی بۆ ئامادەبوان خوێندەوە. وتارەکەی بەندە بە زمانی عەرەبی و شیعر ئامێز بوو، ئەو فەرمووی ئەگەر لە سەرەتاوە بمزانیایە وتارەکەت عەرەبییە پێم دەکردیت بە کوردی، چونکە ئەم شارە پێویستی بە زمانی کوردی هەیە، با ئەوەشم لەیاد نەچێت کە لەگەڵ کردنەوەی زانکۆی خانەقین دا، د. عیزەدین و بەندە، وەک دوو خۆبەخش ئامادەییمان دەربڕی، کە لەو زانکۆیە وانە بڵێینەوە، دیارە بەندە کاری پارلەمانی، ئەو ڕێگایەی لێگرتم.

د. عیزەدین گەلێک پێشەکی بۆ کتێبی نووسەران چێ کردووە، دیارە مەبەستی نووسەران لە پێشەکییەکە، یان گرنگی دانە بە بابەتەکە، یان بەهێزکردنی و برەودانە پێی، یان بەهەند وەرگرتنی کتێبەکەیە چ وەک خۆی، چ وەک بایەخدان پێی لە ڕێگای پێشکییەکەوە... یان... یان.

ئەوەندەی بەندە لە ڕێگای خوێندنەوەی پێشەکییەکەوە هەستم کردبێت، بۆ هەندێکیان، یان لە ڕوودامāوە، یان هەندێک ئیعتباراتی ناچارکەر هەبوو، بەڵام خودی پێشەکییەکە سەنگ و پێگەی ئەکادیمی خۆی هەبووە، وەک ئەوەی ئەحمەد موختار و (مسألة کردستان)ی قەدری جەمیل و... هتد، ئەمە جگە لە کۆمەڵێک توێژینەوەی دەوڵەمەند کە لە بۆنە جیاکاندا خوێندویەتیەوە، هەروەک لە دیدارەکانی مەولەوی و گەلێکی تردا، خۆزگە ئەم بابەتانەشی کۆدەکرانەوە لە چوارچێوەی کتێبێکدا؛ چونکە ئەهمیەتی مێژوویی و ئەکادیمی خۆیان هەیە.





# د. عیزەدین پیاوێکە لە یاقووت



**مستەفا ساڵح کەریم**

لە نێوان عیزەدینی مەلا مستەفای هاوڕێی خوێندنم لە یەکەم قۆناغی ناوەندیدا تا ئێستای پرۆفیسۆر د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، زەمەنێکە پڕ لە تاڵی وخۆشی، لە سەرکەوتن ونسکۆ، بۆیە ئەرکی من گرانە کە بتوانم هەموو ساڵانی عومرمان بە خێرایی بپێچمەوە و لێرەدا بەکورتی دەربارەیان بدوێم، بەتایبەتی لەسەر کەسێکی هەڵکەوتووی وا کە لە گەلێ بواری جۆراوجۆردا ئەسپی ڕەسەنی خۆی سەرکەوتوانە تاوداوە و لەهەر یەکەشیاندا جێ دەستی دیار بووە، من کە دێمە سەر باسی دکتۆری هاوڕێم ئەوە دووبارە دەکەمەوە کە کەم کەس هەیە بتوانێ هەموو کەسێك ڕازیی بکات، ئەشێ هەبن گلەییان لێی هەبێ، دیارە ئەو جۆرە گلەییانەش لە ئەنجامی ئیشکردن ڕوو دەدات، بەهەرحاڵ کاکە عیزەدینی برادەرم نازیشی هەیە و بازیشی هەیە کە میزاجی باش بێ تابڵێی دانیشتنی خۆشە و قسەکانی بەتامن، بەڵام کە میزاجی تێك بدرێ، دیارە ئەویش گلەیی وگازندەی خۆی هەیە و تووڕەش دەبێ تا سەر ئێسك و نەعوزو بیللا، هەندێ جاریش کە دەگاتە تینی، وای لێ دەکات ناحەقی لەگەڵ بەرانبەرەکەی بکات، بەڵام کە ڕاستی بۆ دەردەکەوێ، هیچی لەدڵدا نامێنێ.

* پرۆفیسۆر د.عیزەدین لە یەکەم وێزگەی حەوانەوە لە سەفەری ژیانمانا (گۆرگی وتەنی) لە مەوقیفی گشتی لە بەغدا یەکمان گرتەوە، لەو کاروانەی بەندیخانەماندا برایان هاوڕێ کەریم ئەحمەد و د.کەمال فوئاد و ئیسماعیل ڕەسووڵ وحەسەن تۆفیق و مەحموود تۆفیق و محەمەد مستەفا و بەهجەت محەمەد و زێوەر خەتتاب وکەسانێکی تریشمان لەگەڵدا بوون. ئیتر ئەوە سەرەتایەك بوو بۆ ئاشنایەتی د. عیزەدین لەگەڵ گرتن و فەسڵ کردن و خۆشاردنەوە و غوربەت چەشتن.

* لە قۆناغی ناوەندیمانا، ئێمە دەستەیەك لە برادەر و هاوڕێی لێك نزیك بووین، زۆر زووش چوینە ناو سیاسەتەوە، لە هاوڕێ دیارەکانمان د.عیزەدین و محەمەد کەریم فەتحوڵڵا ناسراو بە (ئەبو سامان)، چوونە ڕیزی پارتییەوە، شەهید دارا تۆفیق و منیش چووینە پاڵ حزبی شیوعی عێراقییەوە، بەڵام هاوڕێیەتیمان هەر بەردەوام بوو، دوای ئەوەی ئەو لە کۆلێژی شەریعە وەرگیرا و جبەی پۆشی و فیستی سوور و مێزەری نایە سەری بوو بە شیوعی، ئەوسا ئیتر لەژێر جبەکەیدا

بەیاننامە نهێنییەکانی دەشاردەوە، تا وای لێهات سوورایی شیوعییەتەکەی لە سوورایی فێستەکەی زۆر تۆختر بوو.

دوای ئەوەی وازی لە شەریعە هێنا، هاتەوە سلێمانی و ئامادەیی تەواو کرد، ئەمجا چووە دار المعلمینی عالیە، بەڵام لەوێش فەسڵ کرا، گەڕایەوە سلێمانی و بوو بە مامۆستا لە قوتابخانە سەرەتاییەکان لە قەمچوغە و قەڵادزێ و سلێمانی لە قوتابخانەی فەیسەلیە. پاشان گەڕایەوە بۆ دار المعلمینی عالیە، دوای ئەوەی لەوێش تەنگیان پێ هەڵچنی خۆی گەیاندە شام و لە زانکۆی ئەوێ دەوامی کرد و تێکەڵ بەو تێکۆشەرانە بوو کە لە عێراقەوە پەنایان بردبووە بەر سوریای ئەوسا.

* لەگەڵ بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ دا، گەڕایەوە بۆ عێراق و دوا ساڵی دار المعلمینی تەواو کرد و بە مامۆستای زمانی عەرەبی لە ئەعدادیەی مەرکەزی لە بەغدا دانرا، لەوێشەوە تەنسیب کرا بۆ بەڕێوەبەرایەتی گشتیی خوێندنی کوردیی کە تازە دامەزرابوو، لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٠دا یەکێ بوو لەو پۆلە خوێندکارەی بۆ یەکەمجار نێردران بۆ وڵاتی یەکێتی سۆڤیەت بۆ تەواوکردنی خوێندنی باڵا، لەوێش بەدەم خوێندنەوە بەردەوام بوو لەسەر کاری حزبایەتی.

* لەگەڵ ئەم دکتۆرەی کە ئەمڕۆ «ڕۆڤار» ڕێز لە ماندووبوونی دەگرێ، لە زۆر شتدا یەکمان دەگرتەوە، لە نووسیندا، لە ڕۆژنامەنووسیدا، لە بواری سیاسی و کاری ئەدەبی و پیشەییدا، بۆیە هەمیشە لێك نزیك بووین و لەیەکتر دانەبڕاوین، لەم ڕۆژانەدا خۆی دەیوت: بەختیارییە بۆ من کە ئەوەندە ساڵە من وتۆ هاوڕێین و هیچ کاتێ لێك دانەبڕاوین.

* دوای گەڕانەوەی لە سۆڤیەت وەك پسپۆڕێکی ئەکادیمیی لێهاتوو لە بواری پەروەردە و پێگەیاندنی نەوەی نوێدا، لە بواری نووسین و باس و لێکۆڵینەوە و بەرهەمی بەبڕشت و بەپێزدا، لە سەرپەرشتی چەندین نامەی ماستەر و دکتۆرادا، لە دامەزراندن و سەرۆکایەتی یەکێتی نووسەرانی کوردا و لە بەشداریکردنی دیاریی لە میهرەجانەکانی شیعر و دیدارەکانی چیرۆکی کوردیدا و لە بەڕێوەبردنی کۆنگرەکانی نووسەرانی کوردا، لەوساوە تا ئێستا بەردەوامە لە پێشکەشکردنی خزمەتدا و هەمیشەیش دەستە گوڵی ئەو کۆڕ و کۆبوونەوە و دیدار و کۆنگرانە بووە، بە قسە خۆشەکانیشی و بەسەرگورشتەکانی بەشیر موشیری ڕەحمەتی، هەردەم مەجلیسەکانمان خۆشتر دەکات.

لە بواری ئەرکی نیشتمانیشدا، دوای ڕاپەڕین لەسەر لیستی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان لە ١٩٩٢/٥/١٩ هەڵبژێررا بۆ پەرلەمانی کوردستان، ئەو خولە تا ٢٠٠٥ دەوامی کرد. شانبەشانی ئەو کارەی لە پەرلەمان لەسەرپەرشتی کردنی نامەی ماستەر و دکتۆرای خوێندکاراندا و لە وانەبێژیی لە سلێمانی وکۆیە و هەولێر و خانەقین هەر بەردەوام بوو، جگە لە ئەندامێتی لە ئەکادیمیای کوردیی.

لە ڕووی سیاسیشەوە دەڵێ: هەر لەگەڵ حزبی شیوعیدام، لەم بارەیەوە دەگێڕنەوە دەڵێن: هاوڕێ حەمید مەجید موسا سکرتێری حزبی شیوعی عێراق وتویەتی: نە ئێمە دەرمان کردووە و نە خۆشی دەستی لەکارکێشاوەتەوە، کەواتە هەر ئەندامە لە حزبی شیوعیدا.

هەر لێرەدا دەبێ بڵێم: ئەو دەست پێشخەرییانەی لە سلێمانی، ڕێکخراوی ئیبراهیم ئەحمەد و بنکەی ڕووناکبیریی گەلاوێژ و لە هەولێر حزبی شیوعی کوردستانی و لە بەغدا حزبی شیوعی عێراق و سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە کۆنگرەی هەشتەمینی نووسەراندا لە سلێمانی و لقی هەولێری یەکێتیی نووسەرانی کورد لە هەولێر لە ٢٠١٣/٢/١٠ کردیان، بۆ ڕێزگرتن لە کەسایەتییەکی هەڵکەوتووی وەك د.عیزەدین، مایەی دڵخۆشی هەموو نووسەران بووە، چونکە ڕێزگرتن لە خاوەن قەڵەمێکی وا هەڵکەوتوو، ڕێزگرتنە لە خەبات و قوربانیدان و شەونخوونی و پێزانین و ئەمەکی وەفاداریی بۆ گشت نووسەرانی خاوەن هەڵوێست.

شتێکی ئاشکراو ڕوونە کە دکتۆری هاوڕێم جێی شانازییە بۆ کتێبخانەی کوردیی و کتێبخانەی عێراقی، کە زیاتر لە هەشتا بەرهەمی ئەدەبی و کەلتووری و سامانی نەتەوەیی بە کوردی و بە عەرەبی پێشکەش کردووە.

خوازیارم تەمەنی درێژ بێ و قەڵەمی بەبڕشتی هەر بەردەوام بێ بۆ خزمەتی نەتەوەکەی و گەشەپێدانی ئەدەبی کوردیی.

دەیان چەپکە گوڵیش بۆ سەر مەزاری هەموو ئەو ئەدیبانەی ئێستا لەناوماندا نەماون و ئاسەوارە ئەدەبییەکانیان بە زیندوویی ماونەتەوە، کە لەگەڵ زۆرینەیاندا چ د.عیزەدین و چ بەندەش، چەندین یادەوەریمان لەگەڵیاندا هەیە، یادیان بەخێر.

# دوو کاتژمێر لەگەڵ پرۆفیسۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ

پرۆفیسۆر د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، ناوێکی دیاری ئەدەبیاتی کوردییە، پێویست بەوەناکات ئێمە لەم پێشەکییە کورتەدا بەخوێنەری بناسێنین، ئەوەندە هەیە بۆ ڕۆڤار پێمان خۆش بوو دانیشتنێکی کراوەی لەگەڵ سازبکەین، دانیشتنەکەمان زۆر تەوەر و لایەنی لەخۆ گرتبوو، لەباری خێزانیی و منداڵیی خۆیەوەوە بۆ خوێندنی لەیەکێتی سۆڤیەت و دواتر کاری حیزبایەتی و یاداشتەکانی وپەیوەندی خۆی و نووسەرانی تر و چەندین پرسی تر، لەو دانیشتنە دوو کاتژمێریەدا زۆر باس و پرسی گرنگمان وروژاند ئەم چاوپێکەوتنە، پوختەی دانیشتنەکەمان.

**چاوپێکەوتنی: ڕۆڤار**



د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ- کامەران سوبحان

*** بەو پێیەی بەڕێزتان وەك پسپۆڕ و ئەکادیمییەك لەبواری ئەدەبیاتدا کاردەکەن، بەڵام کاتێك خوێنەرێك بەشی یەکەمی یاداشتەکانی تۆ دەخوێنێتەوە، ئەوەی بۆ دەردەکەوێت تۆ لەسەرەتاکانی ژیان و تا خوێندنت لە بەغدا و ڕوسیا و دواتر گەڕانەوەت بۆ کوردستان زیاتر باسی ژیاننامەی خۆت دەکەیت لەناو کاری سیاسیدا، کەمتر ئاوڕ لەلایەنی کولتووری و ئەدەبی و خوێندنی خۆت دەدەیتەوە، بۆچی زیاتر باسی سیاسەت دەکەیت؟**

–پێش هەموو شتێک ئەوە یاداشتی منە، من بۆچوونێکی تایبەتیم لەسەر یاداشت هەیە لەبەر ئەوەی بیرمان نەچێت من مێژوو نانووسمەوە، من یاداشتی خۆم دەنووسم، ئەوەی بینیوومە و ئەوەی هەستم پێکردووە، بۆ نموونە کە باسی ٢٠١٣ بکەین لە یاداشتدا باسی ئەو ساڵە ناکەین کە چی ڕوویدا، باسی ئەوە دەکەم کە من چیم بینیوەو چیم کردووە، ڕەنگە یاداشتەکانیشم بەشی یەکەم بەهەمان شێوە بێت، ئەگەر سەیری ئەم یاداشتانە بکەیت دەبینیت لە منداڵییەوە دەستم پێکردووە، لە خێزانەکەی خۆمەوە بۆ هاوڕێ و بنەماڵە و تا ڕووداوەکانی دوایی، من یاداشتەکان بەش بەش دەنووسمەوە، ئێستا بەشی یەکەم چاپ بووە لەسەردەم، بەشی دووەم لەژێر چاپدایە، ڕەنگە لەکۆتاییدا بگاتە هەشت بەش. بەڵام دەمەوێت ئەوە بڵێم کاتێک یاداشتەکانی شاعیری نەمر شێرکۆ بێکەسم خوێندەوە (نووسین بە ئاوی خۆڵەمێش) بۆچوونم گۆڕانکاری بەسەردا هات لەبارەی یاداشت نووسینەوە، لەو یاداشتانەوە فێری ئەوە بووم بەڕیزبەندی ڕووداوەکان نەگێڕمەوە، بەڵکو ئەوەی هات بە مێشکمدا بەبێ گوێدانە مێژوو و ڕیزبەندی ڕووداوەکە دەینووسم، هەروەک چۆن شێرکۆ بێکەس ئەم تایبەتمەندییەی لە یاداشتەکانیدا ڕەچاو کردووە.

***بەڵام هەست ناکەیت یاداشتەکانی تۆ و شێرکۆ بێکەس جیاوازن، بۆ نموونە لەڕووی زمانەوە، لەڕووی تەکنیکی گێڕانەوە، لەروی چیرۆك و بەسەرهاتەوە، ئەم دوو یاداشتە کە جیاوازبن تۆ چۆن سوودی لێ دەبینیت، لەکوێدا سوود لەو یاداشتانەی ئەو دەبینیت بۆ نووسینی یاداشتەکانی خۆت؟**

– دەمەوێت ئەوە بڵێم لە زۆر لایەندا شێرکۆ بێکەس شاعیرێکی گەورە بوو، توانایەکی گەورەی لەڕووی زمانەوە هەبوو، بەڵام زمانی پەخشانیشی زۆر بەرز بوو، کوردییەکی باشی دەزانی، ئەگەر من پێناسی ئەو بکەم لەیاداشتەکانیدا ئەوەندە دەڵێم کە ئەو پیاوێک بووە لەگەڵ خۆیدا ڕاستگۆ بووە، بۆیە من لە ڕووی زمان و شێوازی گێڕانەوە و پابەندنەبوون بە زنجیرەی ڕوداوەکانەوە سودم لەو یاداشتانە بینی.

*** هەرلەسەر لەیاداشتەکانت بەشی یەکەم دەبینین تۆ زۆر بەبایەخەوە باس لە ململانێی پارتی و شیوعی دەکەیت و ڕەنگدانەوەی لەسەر بارودۆخی کۆمەڵایەتی وسیاسی و ڕۆشنبیریی ئەو کاتەی کوردستان، تۆ پیاوێکی ئەدیب و نووسەریت بۆ هێندە بایەخت بەو ململانێ سیاسییانە داوە، لەنێوان ئەو دوو حزبەدا، پێت وایە ئەو ململانێیە چ زیانێکی بە دۆزی کورد گەیاندووە لەو قۆناغەدا؟**

– ئەوە تێبینییەکی جوانە، بۆ لەمەودوا سودی لێ دەبینم و دەکرێت ئیشی لەسەر بکەین، بەڵام بارودۆخی سیاسی ئەو کاتە ئەوە بووە کە من باسم کردووە، بێگومان ململانێی شیوعی و پارتی لەو قۆناغەدا هەبووە و ڕەنگدانەوەی لەسەر هەموو ئاستە ڕۆشنبیریی و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان هەبووە، هەر نمونەیەک لەبواری ڕۆشنبیریدا ئەو کات پارتی زۆریان پێ ناخۆش بوو گەورەترین شاعیری کورد شیوعی بێت کە (گۆران)



کتێبخانەو بەشێك لەدەستنووسەکانی مەلا مستەفای صەفوەت

بوو، کە بێگومان گۆران بەهۆی بیرو ئایدۆلۆژیاوە هاتوەتە ناو شیوعییەتەوە، لەبەرامبەر گۆراندا ڕەنگە پارتی ویستبێتی کەسێکی تر درووست بکات، ئەمە بۆخۆی ڕەنگدانەوەی هەبوو لەسەر ئەو ململانێیە.

*** باوکتان مەلا مستەفای سەفوەت، پیاوێکی منەور و ئاینپەروەری سلێمانی بووە، بەڵام نە تۆ و نە هیچ کوڕێکی نەچووەتەوە سەر ڕێبازی باوکی، لەکاتێکدا لەسەرەتاکانی ژیانی تۆ بە فەقێیەتی دەستت پێکرد و دواتر بوویتە مارکسییەکی نیشتیمانپەروەر، پێچەوانەی شیوعییەکان، ئێوە لە زۆر شوێندا باسی نیشتیمانپەروەری و کوردستان و دەوڵەتی کوردیتان کردووە؟**

– شیوعییەت نیشتیمانپەروەرییە و لوتکەی ئەو نیشتیمانپەروەریەشە، سەبارەت بە باوکم، ڕەنگە فاروق زیاتری لەگەڵدا ژیابێت، چونکە من زوو چوومە دەرەوە ئەوەندەی من باوکم بناسم باوکم پیاوێکی خوێندەوار بوو، بەردەوام دەیخوێندەوە لەناو مەلاکاندا دیاربوو، مەلا ئەحمەدی بانیخێڵانی لە یاداشتەکانیدا دەڵێت «مەلا مستەفای سەفوەت مەلای ئەم سەردەمە بوو هی ئەو سەردەمە نەبوو».باوکم لەو سەردەمەدا بە دۆستی شیوعییەکان دەژمێردرا، چونکە لەگەڵ مەحمودە فەنی هەمەوەندا هاوڕێ بوو کە دەهاتیشە سلێمانی لەماڵی ئێمە دەمایەوە، تەنانەت مەحمودە فەنی حیزبی شیوعی پاڵاوتی بۆ پەرلەمانی عێراق لەساڵی ١٩٤٨ جارێکیان پێی وتم باوکت لەخۆی تێکدا ئەگەرنا بڕیار بوو حیزبی شیوعی پێکەوە کاندیدمان بکەن بۆ پەرلەمان، باوکم لەگەڵ شیوعی تێکیدا لەسەر مەسەلەی فەلەستین، چونکە بۆچوونیان جیاواز بوو لەگەڵ شیوعی بۆ مەسەلەی فەلەستین، چونکە باوکم بۆ مەسەلەی فەلەستین وەک خاکی موسوڵمان سەیری فەلەستینی دەکرد کە جولەکەکان داگیریان کردووە، منیش بەهەمان شێوە لەو ڕێبازە لام نەداوە، من لەسەرەتاوە فەقێیەتیم نەکردووە، بەڵام لە حوجرە خوێندومە لەگەڵ ئەوەی کە خستمییە قوتابخانە بەڵام وەک گوێگر هەمیشە ڕۆشتووم لەمزگەوتەوە گوێم لە وانەی ئاینی گرتووە لای باوکم، خوێندنی ئاینیم تەواو کردووە بەڵام ئیجازەی ئاینیم وەرنەگرتووە.

*** ئەو کاریگەرییەی باوکت بۆ تۆ، بەهەمان شێوەش کاریگەریی تۆ بۆ منداڵەکان ڕەنگدەداتەوە، بۆچی هیچ منداڵێکت وەك خۆت لەبواری ئەدەبیاتدا کار ناکات؟ ئایا کاریگەریی تۆ لەسەر ئەوان وەك نووسەر هەیە یان ئەوان لە بوارێکی جیاوازتردا کار دەکەن؟**

– لەڕاستیدا منداڵ زیاتر دایکیان پەروەردەیان دەکات، چونکە دایک زیاتر لەگەڵ منداڵ هەڵسوکەوت دەکات، من سێ کچم هەیە دایکیان زیاتر پێیانەوە خەریک بوو تا خوێندن تەواو بکەن و شتی باش و کۆلیژی بەرز بخوێنن بەپێی ئاستی ڕۆشنبیریی خۆیان و ئارەزووی خۆیان هەریەکەیان شتێکیان خوێند، ڕاز ئەندازیاری کارەبای تەواو کرد، یار بویە دکتۆری چاو، لە منداڵییەوە زۆریان دەخوێندەوە، زۆربەی ئەو کتێبانەی دەمهێنانەوە ئەوانیش دەیانخوێندەوە، بە ئێستاشەوە خوێندەوارن و عاشقی کتێبن، بەڵام بادە ئابوری خوێند کەمتری دەخوێندەوە، من نەم ویستووە بەزۆر بەمنداڵەکانم بخوێنم و ببنە نووسەر، خۆیان ئازاد بوون لە هەڵبژاردنی بابەتی خوێندنەوە.

*** ئێوە تێزی دکتۆراکەتان لەسەر ئەحمەدی خانی بووە، یەکێکن لەو کەسانەش کە پلەی دکتۆرای (ناوك)تان لە ئەدەبیاتدا هەیە، کە جگە لە تۆ یەك کەسی تر لە کوردستاندا ئەم پلەیەی هەیە، دەمەوێت بپرسین بۆچی ئەحمەدی خانی؟ ئەو خاڵ و بنەمایانە چین کە ئەحمەدی خانیت هەڵبژاردووە بۆ نووسینی تێزی دکتۆراکەت؟**

– زۆرجار ئەم پرسە وروژێنراوە ڕاستە من پێشتر (گۆران)م ناسیوە، بەڵام خانی نا بەڵام ئەمانە دوو لوتکەی گەورەی شیعری کوردین، کورد شاعیری تری هەیە، بەڵام (گۆران و خانی) درووست نابێتەوە. ئێستاش دەیانخوێنمەوە شتی نوێی لێدەبینم، لەڕاستیدا خانی فەیلەسوفێکی گەورە بووە، بیرێکی گەورەی فەلسەفی هەبووە، کەسێک لەم ڕۆژانەدا لەتەلەفزیۆن قسەی دەکرد، هەرلەخۆیەوە گاڵتەی بەوە دەکرد کە کورد فەیلەسوفی هەبێت، خەریک بوو وەڵامی بدەمەوە بەڵام وازم لێیهێنا ئەو ئەگەر وا بیربکاتەوە وەڵامدانەوەش هیچ سودێکی نییە، خانی لە زۆر لایەنەوە فەیلەسوف بووە، بەتایبەتی لایەنی زمان، ئەو خەڵکی بایەزیدە لەبۆتان مەم و زینی نووسیوە، بەڵام دەبینین زمانی مەم و زین تێکەڵە (کوردی، عەرەبی، سلیقی، دەلی، تازی) و چەندین جۆری تری دیالێکت و زمانی تێکەڵاو کردووە، ئەمە گرنگە و بابەتی دەیان نامە و توێژینەوەیە،





گۆرانیش بەهەمان شێوە شیعری نووسیوە تا بیخوێنیتەوە مانای نوێی لێبەرهەم دێنیت، جارێکیان لەگەڵ ڕەمزی قەزاز و ڕەفیق چالاک ڕۆشتووە بۆ ڕادیۆی کورد و کوردستان، لە فەلەستین ڕۆژێک دەچن بۆ کەناری دەریا دەبینێت کچ و ژنە جولەکەکان بەرووتی لەکەناری دەریا پاڵکەوتوون و مەلە دەکەن، بە گۆرانیان وتوە سەیری ئەم هەموو کچە جوانە لەم وڵاتەدا هەیە، گۆرانیش دێرە شیعرێک دەڵێت کەئەویش ئەمەیە:

کانییەکی ڕوونی بەر تریفەی مانگە شەو
لەبنیا بلەرزێ مرواری زیخ و چەو
جوانترە لەلای من لە دەریای بێ سنور
شەپۆلی باتە بەرتیشکی ڕۆژ شڵپ و هوڕ

سەیری ئەم دێرە شیعرە بکە دەزانیت گۆران چەند گەورەیە، ڕەنگە ئەم دوو نمونە وەڵامێکی باش بێت بۆچی لای من (گۆران و خانی) ئەوەندە بایەخیان هەیە.

*** بەدەر لە ئەحمەدی خانی تۆ لە نووسین و لێکۆڵینەوەکانت زۆر باسی (گۆران) ی شاعیرت کردووە، تەنانەت لە سەرپەرشتیاری تێزی ماستەر و دکتۆراشدا سەرپەرشتیاری چەندین تێز بوویت لەسەر (گۆران) لە زانکۆکانی کوردستاندا، بزانین تایبەتمەندی گۆران لە شیعر و ئەدەبیاتی کوردیدا چییە و چ بنەمایەك گۆران جیا دەکاتەوە لە شاعیرانی تری کوردی؟**

- گۆران زمانەکەی و تەکنیکی شیعریی و وێنە شیعرییەکانی جیای دەکاتەوە لەهەموو شاعیرانی تری کورد، خانی بەهەمان شێوە بەڵام هەر شاعیرە و تایبەتمەندی خۆی هەیە، ئەدەبیش شتێکی ڕێژەییەو لای من و بە بینینی من وایە، لای تۆ یان لای کەسێکی تر ڕەنگە جیاواز بێت. بۆیە من پێشتر باسم کرد (گۆران و خانی) دوو لووتکەن و نمونەیان نییە لە ئەدەبی کوردیماندا.

*** هەر لەسەر چاپکردنی دیوانی گۆران، پێم وابێت لەگەڵ حەمەی مەلا کەریم گرفتێکتان بۆ درووست بوو؟**

- پێش چاپکردنی دیوانی گۆران من چووم بۆ مۆسکۆ، پێشەکییەکەم لا دانا ئەویش دابووی بەچاودێریی، ئەوانیش نەیانهێشتبوو، دواجار کاکە حەمە خۆی پێشەکی بۆ نووسیبوو، کە هاتمەوە پێشەکییەکەی من دیار نەبوو، بۆ مێژووش بیڵێین کاکە حەمە دیوانی گۆرانی پاراست بوو، چونکە لە (بەدرە)لەگەڵ گۆران پێکەوە بوون، وردە وردە دیوانەکە لای کاکە حەمە کۆبووبویەوە و پاراستبووی، لەم لاو لاش دەچوو لە ژین و لای ڕەئوفی خانەقا شیعرەکانی تری گۆرانی کۆ دەکردەوە، لەکاتێکدا کە بارودۆخی ئەو کات خراپ بوو کاکە حەمەی مەلا کەریم زیرەکانە دیوانەکەی گۆرانی لە کتێبخانەی شێخ عەبدولقادری گەیلانی پاراستبوو، چونکە لەوێ کەس بۆی نەبووە دەسکاری بکات، دواتر ئەو دیوانەکەی بە موڵکی خۆی دەزانی چونکە خۆی لە فەوتان پاراستبووی، هەر



کامەران سوبحان - د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ- ڕەووف بیگەرد

ئەو کات حیزبی شیوعی لیژنەیەکی دروستکرد بۆ ئەوەی حیزب دیوانەکەی گۆران چاپ بکات، لیژنەکەش پێکهاتبوو لە (کاکەی فەلاح، جەلال دەباغ، حەمەی مەلا کەریم و من) هەر سەرەتا کاکە حەمە وتی من باوەڕم بەم لیژنە ساختەیە نییە، کاکەی فەلاحیش وتی هێشتا ئێمە کۆنەبووینەتەوە بۆچی لیژنەکە ساختەیە؟! کاکە حەمە باوەڕی وابوو مادام خۆی دیوانەکەی گۆرانی پاراستووە مافی خۆیەتی خۆی چاپی بکات.

*** لەژیانی ئەدەبی تۆدا خۆتت لە زۆر بوار داوە، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، فۆلکلۆر، چیرۆکنووسین، ساغکردنەوەی دەستنووس، تەنانەت شیعر نووسین بەڵام بڵاوت نەکردووەتەوە، هۆی چییە لەو فرە بوارەدا کارت کردووە، هەست ناکەیت کارکردن لەچەند بوارێکدا نووسەر و توێژەر پەرش و بڵاو دەکاتەوە؟**

– من پێچەوانەی تۆ بیردەکەمەوە، من پێم وایە توانای داهێنانی ئەدەبی ئەو کەسە بەستراوە بە خۆیەوە، من کۆمەڵێک چیرۆکم بەناوی (شاتوو) چاپکرد، من چیرۆک و شیعرم هەیە، بەڵام ئەوە نییە بچنە ڕیزی شیعر و چیرۆکە گەورەکانی کوردەوە، بەڵام زۆر ئاست نزمیش نین و دەکرێت لەبەرچاو بگیرێن، شیعرەکانم زۆر کەس لەبەریان کردووە چونکە پێیان خۆش و ئاست بەرزە، بەڵام بڵێم لەئاستی گۆران یان شێرکۆ بێکەس یان فلان شیعری تردایە بێگومان نەخێر وانییە، چەندین جار وتوومەتەوە جاحز وتەیەکی جوانی هەیە کە دەڵێت «هەمو سەردەمێک شاعیرێک دروست دەبێت.!»ئەم وتەیەی جاحز بۆ ئەو هەموو شاعیرەی عەرەب بووە لە شیعری جاهیلییەوە بۆ شیعری سەردەمی خۆی، ئەی ئێمەی کورد؟! ئەوە پرسیارەکەیە کە من هەمیشە کردوومە، بۆیە من پێم وایە دەبێت چۆن توێژینەوەکانم بڵاوکردوەتەوە بەهەمان شێوە شیعر و چیرۆکە باشەکانیش بڵاوبکەمەوە، زۆرجار لەگەڵ خێزانم گفتوگۆمان لەسەر ئەو بابەتە دەبێت، دەڵێت هەستە فلان شت بنووسە، یان ئەو شتەت تەواو بکە، من دەڵێم لێم بگەڕێ من نووسین بە میزاج و چێژی خۆم دەنووسم، کەی بۆم هات دەست پێدەکەم، نەک کاتی دیاری کراو، بۆ نمونە گۆشەیەکم هەیە لە کوردستانی نوێ بەناوی (کونج) نووسینی کورتە کە سەیری تەلەفزیۆن یان ڕوداوێکی ڕۆژ دەکەم بۆم دێت و دەینووسم بە بێ ئەوەی کەس پێم بڵێت.

*** ئەوەی ئێمە بزانین ئێستا سەرقاڵی یاداشتەکانتی بەشی دووەم، بەدەر لەم کتێبە چ کتێبێکی ترت ئامادەیە بۆچاپ و باسی چی دەکات و ناوی چییە؟**

– بەدەر لەیاداشتەکان سەرقاڵی بەشێکی ترم لەمێژووی ئەدەبی کوردی، کەرەستەی پێویست و شتی پێویستم بۆ داناوە، کتێبێکی ترم هەیە لەسەر بەکر سدقی، ئیشم تێدا کردوە و شتی نوێم وتوە کە لەکتێبەکانی تردا نەوتراوە، چونکە بەلای منەوە کورد بووە کوردێکی تەواو و ڕەسەن، خەونی هەبووە دەوڵەتی کوردی دروست بکات.

*** ئەوەی ئێمە دەیزانین لەبواری ساغکردنەوەی دەستنووسی کوردیدا ئێوە خاوەن دەیان و سەدان دەستنووسی گرنگن، لەوانە چەندین دەستنووسی مەلا مستەفای سەفوەت لە کتێبخانەکەتاندا هەیە، بۆچی تا ئێستا بڵاوتان نەکردوەتەوە و بۆچی لەو بوارەدا کەمتر هەوڵتان داوە، بەتەمان چی بکەن لەو هەموو دەستنووسە گرنگانەی لە کتێبخانەکەتاندا هەیە؟**

– لەڕاستیدا ئەمە پێشنیارێکی زۆر باشە و خۆشم بیرم کردووەتەوە ئیشی تێدا بکەم، بۆ نمونە کۆمەڵێک لە کتێبەکانی باوکم ماوە دەستنووسن و ساغیان بکەمەوە، بەتایبەتی دوو تەفسیریی قورئانی هەیە تا ئێستا چاپ نەکراون، ئەوەی باوکم زۆر جیاوازە لە تەفسیرە کوردییەکانی تر، بۆ نمونە شێخ محەمەدی خاڵ تەفسیری هەیە ڕێک ئەوەی (محەمەد عەبدە)یە وەریگێڕاوە بەس نەیوتوە وەرمگێڕاوە، مەلای گەورە نەیوێراوە ئەو فکرانەی خۆی هەیەتی وەک خۆی بیڵێت، بەدەر لە کتێبەکانی باوکیشم شتی تریشم لایە وردە وردە هەموویان ساغ دەکەمەوە و چاپیان دەکەم.

*** ئێوە کۆمەڵێك نووسەر و ئەکادیمی بوون کە لەڕوسیا خوێندنی باڵات لەبواری ئەدەبیاتدا تەواو کرد، نووسین و کتێب و وەرگێڕانەکانیشتان کاریگەریی زۆری لە نێوەندی ئەدەبیدا هەبوو، بەڵام ئەوەی ڕەخنە لەئێوە لەو ئەکادیمیانە دەگیرێت هەندێجار ململانێ و جیاوازییەکانتان بووە بەشەڕی شەخسی، بۆ نمونە شەڕی نێوان تۆ و خوالێخۆش بوو دکتۆر مارف خەزنەدار، دەکرێت خوێنەر بزانێت شەڕی تۆ و ئەو لەسەر چی بووە؟**

– زۆر سوپاس بۆ ئەم پرسیارە، لەڕاستیدا من گرفتم لەگەڵ کەسیاندا نەبووە و دڵیشم پاکە لەئاست ئـەوان و هەمو کەسێکیشدا، ئێمە لە ١٩٦٠-٣-٧ بۆ خوێندن لە ڕوسیا بەیەک فڕۆکە ڕۆیشتین و هاوڕێ بووین، ساڵێک لە مۆسکۆ زمانمان خوێند و دواتر دابەش بووین بۆ شوێنە جیاوازەکان بۆ خوێندن، ئەوکات ڕەحیمی قازی هات بۆ لامان وتی پێم خۆشە چەند کەسێکتان بێن بۆ باکۆ چونکە لەوێ بەشی ڕۆژهەڵاتناسی لێیە و ئێمەش بەشێکین لەناو ڕۆژهەڵاتناسی، ئێوە بێن و قوتابی دکتۆرابن دەکرێت بەبەشی سەربەخۆ، من و دکتۆر کەمال و دکتۆرە نەسرین فەخری ڕۆشتین بۆ ئەوێ، دواتریش سەردانی لینینگرادمان کرد، کوردۆیف لەوێ بوو حەزی دەکرد ئێمە بڕۆین و دۆستی کورد بوو، بارزانی خۆش دەویست و دەیوسست لەئێمەوە کوردییەکەی باشتر بێت، بەهەر حاڵ لەباکۆ دکتۆر مارف خەزنەدار هات بۆ لام و یەک مانگیش لام بوو، تەنانەت کتێبیشم دەداپێی و پەیوەندیشمان هەبوو، هەرچەندە کەمێک تەبیعەتمان لەیەک جیاواز بوو بەڵام گرفتێکی وامان نەبوو، تەنانەت جارێکیش د.کەمال مەزهەر گلەیی لێکردم وتی تۆ منت هێناوە بۆ باکۆ، منیش پێم وت ئەگەر تۆ نەهاتیتایە بۆ باکۆ نەدەبوویت بەم د.کەمال مەزهەرەی ئێستا، چونکە لەباکۆ

عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ



هەرچی ئەرشیف و مێژووی کورد هەیە خستیانە بەردەستی، زۆر شتی لاماوە تا ئێستا بڵاویان نەکردووەتەوە، لەو ڕۆژەی مردووە من هیچم لەدڵدا نەماوە و تەلەفونیشم کرد بۆ جەمال خەزنەداری برای و خوالێیخۆش بێت.

*** یەکێك لەو ڕەخنانەی لە ئێوە دەگیرێت ئەوەیە کە ئێوە لەگەڵ زمانزانین و خوێندنتان بەڕووسی نەتانتوانی کۆمەڵێك شاکاری گـەورەی ئەدەبی ڕووسی بکەن بە کوردی؟**

– من بۆخۆم زۆر شتم لە روسییەوە کـردووە بە کوردی، ئەوەش دەزانن وەرگێڕان کارێکی وا ئاسان نییە وداهێنانە، ویستم کتێبێک لەسەر ئەدەبی بەراوردکاری بکەم بە کوردی، بەڵام بینیم ئەو زاراوانە لە ئەدەبی کوردیدا نییە، لەکاتێکدا ئەم کتێبە بۆ فێرخوازانی ماستەر و دکتۆردا زۆر گرنگ و پڕ بایەخە، لەو کتێبە ٨٠٠ لاپـەڕەم لەڕوسییەوە کرد بەعەرەبی، بەڵام ڕەنگە بۆ کوردی ئەستەم بێت.پاش ٤٠ ساڵ چوومەوە بۆ ڕووسیا پێیان وتوم ڕوسییەکەت زۆر باشە چونکە بەردەوام پێی دەخوێنمەوە، لەوێش هەبووە ڕوسی نەزانیوە بەڵام یارمەتیان داوە بۆ فێربوونی زمان و نووسینی تێزی دکتۆراکەی.

*** باشە ئەگەر ڕوسی نەزانێت چۆن تێز دەنووسرێت، کەواتە بۆیان نووسیوە؟**

– من ناڵێم بۆیان نووسیوە، من دەڵێم هاوکاری کراوە لەڕووی زمانەوە، ئەوە ڕاستییەکە، بەڵام من بۆخۆم گرفتی زمانم نەبووە و بەجوانی و بەپاراوی فێریی بووم.

*** لەوێ ئێوە زۆر شتتان لەسەر قازی محەمەد بیستووە و خوێندوەتەوە، دەکرێت بزانین چ شتێك لەو زانیارییانە لەسەر قازی هەیە و کورد لە کوردستان نەیزانێت؟**

– بۆ زانیاریتان پێشەوا قازی محەمەد چەند جارێک چووەتە باکۆ و باگیرۆفی بینیوە، باگیرۆف پێی وابووە پێویستە کوردستان ئۆتۆنۆمی هەبێت لەناو ئازەربایجانێکی یەکگرتوو، پێشەوا قازی محەمەد خوێندەوارترین سەرکردەی کورد بووە، لە هەموو کەس زمانی باشتر زانیووە، ڕوسەکان دەڵێن زۆر بەڕوونی و پاکی ڕوسی زانیوە، ئەم زمانانەی زانیوە (کوردی، عەرەبی، فارسی، تورکی، ئینگلیزی، فەڕەنسی، روسی)تەنانەت سەرت سوڕدەمێنێ ئەم مەلایە چۆن لە مەهاباتدا فێری ئەم هەموو زمانە بووە، هەرگیز کورد سەرکردەی وای نەبووە، ئێستاش کە دەچم لەگەڵ کاک عەلی قازی بەدوای ئەوەدا دەگەڕێین بزانین ستالینی دیوە یان نا؟ چونکە قسەیەک هەیە قازی نەمر چووە لە مۆسکۆ ستالینیشی بینیووە، بەڵام تا ئێستا بەڵگەمان دەستنەکەوتووە.


شەوکەت عەزیز فەرەج - عیزەدین مستەفا
بەغداد ١٩٥٩

*** تۆ خۆت بە مارکسی و شیوعی زانیووە بەڵام لە یەکەمین خولی پەرلەمانی کوردستاندا لەسەر لیستی سەوز، کە حیزبێکی ناسیۆنالیزمە بوویتە ئەندامی پەرلەمان ئەمە چۆن بوو؟**

– هەر بۆ زانیاریتان من لە ساڵی ١٩٤٩ وە تا ئێستا ئەندامی حیزبی شیوعیم کوردستان و عێراقیش، بۆ بوون بەپەرلەمانتاریش ئەوان زانیویانە من شیوعیم، چەند جارێک د.کەمال فواد تەلەفونی بۆکردم وتم نایکەم و نابمە پەرلەمانتار، تا حاکم قادر خۆی هات و لەم شوێنەی تۆ دانیشت و پێی وتم تۆ هەڵبژێراوی مام جەلالیت چۆن دەڵێت پەرلەمانتاری ناکەم، وتم نایکەم ڕۆیشت، مام جەلال خۆی تەلەفونی بۆ کردم وتی بۆچی پەرلەمانتاری نایکەیت؟ وتم من شیوعیم، وتی جا شیوعیبە خوای دەکرد مەکتەب سیاسی شیوعی دەبوویت، مام جەلال پێیوتم ئێمە دەمانەوێت تۆ لە لیستی ئێمەدابیت بۆ پەرلەمانی کوردستان. تۆ و خەڵکی تریش هەیە دەبێـت لە لیستی ئێمەدابن، سەرەتای هەڵبژاردنیش بوو ئەمەریکا نەیدەویست شیوعی لە پەرلەمان بێت، پێی وتم وتی شیوعی دەرناچن واباشترە و زۆرم پێخۆشە لە لیستەکەی ئێمەدابێت. بەهەر حاڵ قەناعەتی پێکردم و عومەری سەید عەلی نارد و مامەڵە و ناسنامە و شتەکانی لێوەرگرتم، بەهەرحاڵ وەک پەرلەمانتارێکی بێ لایەن لەناو لیستی یەکێتی بووم بە پەرلەمانتار، هەمیشە پارێزگاریم لەو بێ لایەنییە کردووە و وەک بێ لایەنێک قسەم کـردووە، تەنانەت چەند جارێک بەڕەحمەت بێت جەوهەر نامیق سالم سەرۆکی ئەوکاتی پەرلەمان لەسەر ئەو قسانە کردوومیەتییە دەرەوە.

# دکتۆر عیزەدین... ئەستێرەیەکی گەشی زمانی کوردی



شێرکۆ بێکەس

لە ژوورەکانی ماڵی ڕوناکبیری کوردیدا، ڕیزێک چرا هەن چاومان پڕ لە بەهای ئەدەب و مێژوویی دەکەن. یەکێک لەو چرایانە مامۆستام (دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ)ە چرای ئەدەب وئارشیفێکی دەوڵەمەند. بیرێکی ڕوون کە دەچێتە ناو هەموو وردەکاریەکانی ئەو یادەوەریانە کە لە ڕووناکبیری تردا نیە. ئەگەر هەیش بێت، ڕووناکیی کەم و ناوە ناوەیە. بیری دکتۆر یەکسانە بەهێزی قەڵەمەکەی، یان بە جۆرێکی تر بڵێم، بەشێک لە زەمینەی ڕووناکبیری دکتۆر پەیوەندی بە زەینە کاریگەریەکەیەوە هەیە. هەموویش ئەوە دەزانین کە دکتۆر لەمنداڵیەوە لە نێو کتێب و شیعری کلاسیکی و زانستە ئیسلامیەکاندا ژیاوە.زنجیرە وتارەکانی کە بە کوردی و عەرەبی نووسیونی ئاوێنەی قۆناغەکەیان بوون. وەک گوڵە بەڕۆژە بەردەوام ڕوویان لە خەم و ئازاری گەل و چینە چەوساوەکان و سەرجەم مرۆڤایەتی بووە. ئەمە جگە لە کتێب و چاپ کراوەکانی. هەروەها ئەو سەدان وانەئەدەبیانەی لە زانکۆی بەغدا و زانکۆی سلێمانی بە خوێندکارانی وتۆتەوە و گەلێک کتێبیان لێ دروست بووە.

دکتۆر وەک مرۆڤ هەمیشە لەگەڵ مافی مرۆڤ و بیر و باوەڕی دیموکراتی و ڕاپەڕینە ئازادیخوازەکانی دنیادا بووە. یەکێک لەوانە هەڵوێستی جوانی بوو بەرامبەر بە ڕاپەڕینەکەی ساڵی ١٩٩١ کە ماڵەکەی کردبووە شانەیەک بۆ گەنجە شۆڕشگێڕەکان و ڕاوێژە گرنگەکانی خۆی. بەڕای من ئەگەر مامۆستام دکتۆر عیزەدین کەمێک پەرت نەبوایە و وا بەستەی بەرنامەیەکی توندوتۆڵتر بوایە. بێگومان (جوانیەکەی) ئەوەندەی تر(جوانتر دەبوو) لە کارە باشەکانی ئەم مامۆستایەم نووسینەوەی یاداشتەکانیەتی کە دەتوانین ناوی بنێین پانۆرامایەکی ڕەنگاڵەیی بۆ ئەو قۆناغانەی باسیان دەکات.

لە تایبەتمەندیەکانی ئەم مامۆستایەم شارەزاییەتی لەشێوە زارەکانی زمانی کوردیدا، کە بەرئەنجامی تێکەڵ بوونی کۆمەڵایەتی و سیاسی و بەرفراوانیەتی لە هەموو بەشەکانی کوردستاندا و ئەزموونە قووڵەکەیەتی لە ئەدەبیاتی ئەو شێوە زارانەدا. نووسینی لەسەر (ئەحمەدی خانی) و لێکۆڵینەوە و شرۆڤە کردنی بیر و بۆچوون و شیعرەکانی ئەم شاعیرە مەزنە نموونەیەکی بەرجەستەی قسەکانمانە

بە کورتی، مامۆستام دکتۆر عیزەدین مێژوویەکی ڕووناکی پڕ لە زانست و زانیاری و ئەستێرەیەکی گەشی زمانی کوردییە، تۆمارێکی دەوڵەمەندی خۆشی و ناخۆشی قۆناغە جیاوازەکانی ژیانی ڕووناکبیریی و سیاسییە، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی بەشاری (سلێمانی)ەوە هەبێت، ئەگەر بتەوێت بەزمانی شیعر بینووسم ئەوا کانییەکی ئاوی پاک و ڕۆشنی گەرەکی (سەرکارێز)ە.

هیوای تەمەندرێژی و لەشساغی بۆ دەخوازم.بەپەرۆشەوە چاوەڕێی بەشەکانی تری مێژووی ئەدەبی کوردییەکەی دەکەم، بۆ دەوڵەمەندکردنی کتێبەکانمان.

٢٠١٢/٢/٢٧



# فاروقی مەلا مستەفا:
# دکتۆر عیزەدین بەمانای وشە، ڕۆشنبیرە لەهەموو بوارەکاندا.!

فاروقی مەلا مستەفا برا بچوکی د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، لەم چاوپێکەوتنەدا تیشک دەخاتە سەر پەیوەندی خۆی و د.عیزەدین لێکچون و جیاوازییەکانی تەمەنیان باس دەکات، لەم چاوپێکەوتنەدا باسی ئەوە دەکات ئەو چۆن بووە بە بازرگان و د.عیزەدین چۆن بووە بە نووسەر و مامۆستای زانکۆ، لەتەوەرێکی تری دیمانەکەدا باس لە پەیوەندی خۆی و کتێب و خوێندنەوە دەکات و ئاماژە بەوەدەکات وەک بازرگانێک ئاگاداری زۆر جوڵە و چالاکی کولتووری و رۆشنبیریی ئەم وڵاتەیە، بە وردیش باس لە ئاستی ڕۆشنبیریی و زانیاری دکتۆر عیزەدینی برای وەک مامۆستا و برا گەورەیەکی دەکات.

**دیمانە: ڕۆڤار**

***سەرەتاکانی منداڵیتان لەگەڵ د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵی برا گەورەتان چۆن گوزەراندووە، لەچیدا لەیەك چوون و لەچیدا جیاواز بوون، هەردووکتان کوڕی مەلایەکی ناوداری ئایینی، بەڵام دوو ڕێگەی جیاوازتان لەژیاندا گرتە بەر، هۆکاری ئەم جیاوازییە بۆچی دەگەڕێتەوە؟**

–من تەنها ئەو برایەم هەیە و سێ خوشک، بەد.عیزەدین دەڵێم کاکم، ئەو شەش ساڵ لەمن گەورەترە بێگومان ئـەو جـیـاوازی تەمەنە بۆ منداڵی جیاوازییەکی زۆر گەورەیە، چونکە کە من لەدایك بووم ئەو لە پۆلی یەکی سەرەتایی بووە، کە من چوومەتە پۆلی یەکی سەرەتایی ئەو چووەتە ناوەندی، بیریشم ناچێتەوە ئەو ڕۆژەی کە بردمی بۆ وێنەگرتن لای ڕەفیقی مەحمود بەگی ڕەسام بۆ وێنەگرتنی قوتابخانە کە لە قوتابخانەی فەیسەڵییە دەستم بە خوێندن کرد ئەوە سەرەتایەکی زۆر خۆش بوو بۆ من.سەبارەت بەو جیاوازییەی کە تۆ باسی دەکەیت لەنێوان من و ئەودا هەر لەسەرەتاکانی منداڵییەوە دیار بووە، بۆ نمونە د.عیزەدین هەر لەسەرەتاوە لەگەڵ کتێب و خوێندنەوەدا گۆش بوو، زۆر بەکەمی دەهات بۆ کۆڵان بۆ یاریکردن لای منداڵان، لەڕاستیشدا بە ئێستاشەوە بێت ئەو نازانێت ئەو یارییانەی منداڵی چییە، نازانێ شەڕە بەرد، مزراحێن، هەلوکێن و یارییەکانی تر چییە، چونکە لەکاتی خۆیدا نەیکردووە. پێچەوانەی ئەو من خەریکی یاریکردن بووم لەکۆڵان و کەمێکیش عەجول بووم، بەڵام هەردووکمان سودی زۆرمان بینی لە دانیشتنە ڕۆحی و زانستی و ئایینییەکانی باوکمان. هەر لەو منداڵییەوە من سودم لە بەهرە و توانا ئەدەبییەکانی ئەو وەردەگرت تا ئەو کاتەی چووە کۆلیژی شەریعە لە بەغداد دواتریش ماموستایەتی و ڕۆیشت بۆ یەکێتی سۆڤیەت بۆ خوێندن لە هەمو قۆناغەکاندا کاریگەریی لەسەر من هەبووە، بۆیە بەبڕوای من جیاوازی کارکردنمان کە ئەو چووە بواری ئەکادیمی و زانکۆ و من بووم بە بازرگان ئەوە بۆ سرووشت و بیرکردنەوەو کارکردنمان دەگەڕێتەوە لەژیاندا، دەبێت ئەوەش بڵێم باوکم مەلا مستەفای سەفوەت کاریگەرییەکی زۆری لەسەر هەردووکمان هەبوو، هەمیشە لەکۆڕ و کۆبوونەوە ئاینی و زانستییەکانی دادەنیشتین و فێری زانست و ئاینپەروەری دەبووین.

***باسی باوکت کرد، کە کاریگەریی لەسەر هەردووکتان هەبووە و هەردووکتان لە مەجلیسی ئاینی و زانستی ئەو دانیشتوون، د.عیزەدین خۆی دەڵێت لەسەرەتاکانی لاوییەتییمەوە تا ئێستا شیوعی بووم، تۆش بەهەمان شێوە شیوعی بوویت، چۆن دوو کوڕی شیوعی لەباوکێکی مەلا و ئاین پەروەر پەیدابووە، ئایا ئەمە جۆرێك لە گرفتی بۆ دروست نەکردوون؟**

– نەخێر باوکمان مەلایەکی خوێندەوار و کراوە بووە، هەرگیز نەبووەتە ڕێگر لەبەردەممماندا، دواجار ڕاستە ئێمە شیوعین و من پیاوێکی عیلمانیم بەڵام ڕێزم بۆ هەمو بنەما ئاینی



کامەران سوبحان - فاروقی مەلا مستەفا



و ڕۆحییەکانی میللەتەکەم هەیە، باوکیشم هەمیشە وەک پیاوێکی ئاینپەروەری ڕاستەقینە بەیەک چاو سەیری هەمو منداڵەکانی کردووەو کاریگەریی زۆری لەسەر هەمومان هەبووە، لەڕوی کۆمەڵایەتیشەوە پەیوەندی زۆر باشی لەگەڵ خزمان و کەسوکار و ئامۆزاکانی هەبووە، بەتایبەتی شەهید فازیلی مەلا مەحمود، کاکم کاریگەرییی زۆریشی لەسەر ئەمان هەبوو، هەر لەژێر کاریگەریی ئەمدا من لەپۆلی شەشی سەرەتایی کە لەقوتابخانەی خالیدییە بووم چومە ناو ڕیزەکانی یەکێتی قوتابیانی کوردستان لەگەڵ مەحمود کەریم برای هاوڕێ ئەحمەدکەریم بەداخەوە لەساڵی ١٩٦٣ شەهید بوو ئەویش شیوعییەکی پێشکەوتوخواز بوو، هەر لەو کاتەدا بوم بەئەندامی لیژنەیەکی قوتابیانی شیوعی عێراق.

*** ئەمە وەك لایەنی برایەتی و حیزبایەتی، ئەی وەك ڕۆشنبیریی و ئەدەبی چەند سودت لەو بینیووە و چەند ئاگاداری باری ئەدەبی و ڕۆشنبیریی ئەو بوویت؟**

- بێگومان زۆر ئاگاداربووم، د.عیزەدین مستەفا ڕەسول زۆر کەس پێی دەڵێن ئینسکلۆپیدیایەکی گەورە، هەندێ پێی دەڵێن گەورەترین ڕۆشنبیر و ئەکادیمی کوردی، بەڵام لای من دکتۆر عیزەدین بەمانای وشە ڕۆشنبیرە لەهەموو بوارەکاندا. باسی مێژووی لەگەڵ بکە زۆر شارەزای هەیە، باسی جوگرافیا بکە لەو زیاتر، لە ڕەخنەی ئەدەبی و فۆلکلۆردا زۆر شارەزا و بەسەلیقەیە، لە شیعری کلاسیکی کوردی و ناسینی شاعیراندا وریا و لێزانە، لە ئابوری شارەزایە، شیعری عەرەبی کۆن و نوێ زۆر لێی ئاگادارە و زۆریشیانی لەبەرە، فەلسەفەی خوێندوەو زۆر شارەزایە تێیدا، چیرۆک دەنووسێت، شیعری هەیە، پێم وایە لەهەموو ئەو بوارانەشدا جێگە دەستی دیارە و نزیکەی ٨٠ کتێبی پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی کردووە، ئەمە جگە لەسەرپەرشتیکردنی سەدان نامەی ماستەر و دکتۆرا لە زانکۆکانی کوردستان، بۆیە من بەردەوام ئاگام لەکار و چالاکی و کتێبەکانی ئەوە، هەرچەندە لە دانیشتێکدا کاک ڕەووف بێگەرد لەسەر ئەم قسانەم هەڵیدایە و وتی "ئێستا لەناوەندی ڕوناکبیریی و ئەدەبی کوردیدا گەلێک لاوی داهێنەر و بەتوانامان هەیە کە ڕەنگە تۆ نەیانناسیت، وەک نمونەش ناوی (بەختیار عەلی و مەریوان وریا قانع)ی هێنایەوە".



فاروقی مەلا مستەفا - د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ گەلاڵە ١٩٦٦



***ئەی لە هیچ کات و قۆناغێکدا پێکەوە کارتان کردووە، چ وەك کاری سیاسی چ وەك بازرگانی؟**

– بێگومان وەک بازرگانی نا، چونکە ئەو هەرگیز ڕۆژێک جگە لە خوێندن و کتێب و کاری زانکۆیی، هیچی تری نەکردوە .لەڕووی سیاسییەوە من و ئەو پێکەوە کارمان کردووە، ئەو کات د.عیزەدین لە کەرکوکەوە ڕۆشتە بەغدا و لەڕۆژنامەی ئازادی کاری دەکرد، ئەو کاتە منیش ڕۆشتمە بەغدا و لەوێ لەو ڕۆژنامەی حیزب کارم کرد کە بەڕێزان (حەمەی مەلاکەریم و محەمەد کەریم فەتحوڵڵا و نافیع عیزەت) پشمان لەگەڵ بوو کە کاک نافیع سەرنووسەر بوو، ئەو کات باری داراییمان خراپ بوو بەڕۆژ ئیشم دەکرد لە بەغدا و بەشەویش لەو ڕۆژنامەیە کارم دەکرد و تاقیکردنەوەیان کرد لە کوردی بۆ عەرەبی و بە پێچەوانەشەوە زۆر بەدڵیان بوو، دواتر دامەزرام وەک وەرگێڕ لە وەزارەتی ئیرشاد لە بەغدا. لەماوەی ئەو ٣ ساڵ و نیوەی لە بەغدا بووم گۆڤارێک هەبوو ناوی (عێراقی نوێ) بوو من و کاک شەوکەت بابان و حەمەی مەلا کەریم کارمان تێدا دەکرد، من لە ئازادی سودێکی زۆرم بینی چونکە ڕۆژنامەی حیزبی شیوعی بوو، لەو کاتەشدا حیزبی شیوعی کاریگەرییەکی زۆر گەورەی لەسەر گۆڕەپانی سیاسی عێراق هەبوو، کارکردنی من لە ئازادی زۆر خۆش بوو زۆرێک لە سەرکردەکانی حیزبی شیوعیم لەوێ دەبینی (بەهادین نوری و عەزیز محەمەد و کەریم ئەحمەد) ئەمە بۆ من خۆش بوو لەو سەرەتای منداڵییەوە لەنزیکەوە ئەوان ببینم .

***لە ڕۆژنامەی ئازادی لەسەرەتای کارکردن چۆن دەستت پێکرد، کاری چیت دەکرد؟**

–من لەسەرەتادا ڕۆژنامەم بۆ دەپێچانەوە، دواتر دەستم کرد بەهەڵچنی چاپخانەم دەکرد لە چاپخانەی (وەفا) ڕۆژنامەکە دەردەچوو، هەڵچنی لە چاپخانە مرۆڤ فێری زۆر شت دەکات لەو کاتانەدا د.عیزەدین و حەمەی مەلا کەریم شتیان دەنووسی و من دەمبرد بۆ چاپخانە و هەڵچنی دەکرا، ئەوە بوویە باگراوندێک بۆ من بۆ ڕێنووسی کوردی، بە ئێستاشەوە من ڕێنووسی کوردی کەم کەس و نووسەری کوردم بەدڵە .!

***ئەی دوای ڕۆیشتنی بۆ یەکێتی سۆڤیەت و خوێندنی دکتۆرا و هاتنەوەی بۆ کوردستان، ئەو پەیوەندییەتان چی لێهات، وەك خۆی مایەوە یان بەرز و نزمی بەخۆیەوە بینی؟**



– هەرگیز پەیوەندی من و دکتۆر عیزەدین پێکەوە خراپ نەبووە .! هەمیشە وەک برا گەورە و مامۆستای خۆم سەیرم کردوە، پێش ئەوەی بڕوات پێکەوە لە حیزبی شیوعی کارمان دەکرد تا ئەو ڕۆیشت و گەڕایەوە من لە حیزبدا پێش ئەو کەوتم و گەیشتمە پلەی مەکتەبی سیاسی، کە هاتەوە لە ڕوسیا ئەو لەزانکۆ دەستی بەوانە وتنەوە کرد، هەر شیوعی بوو پیاوێکی چاونەترس و بوێر بوو، ئەو شایەتییەی بۆ دەدەم هەرچی خۆی باوەڕی پێی بێت دەیکرد و دەیوت، د.عیزەدین شەرم لەوە ناکات بەرامبەرەکەی بەوەی ئەو

ڕازین یان نا. ڕاستی وتوە با کەسانێکیش هەبن پێیان ناخۆش بوبێت، بۆیە لە ماوەی تەمەنماندا وەک دوو برا من هەمیشە بەچاوێکی ڕێز و گەورەوە سەیری ئەوم کردووەو ئەویش بەهەمان شێوەو هەرگیز پەیوەندیمان بەرز و نزمی تێنەکەوتووەو هەمیشە لە ترۆپکی خۆشەویستیدابووە.

***ئەی سەبارەت بە کاری بزنس و ڕۆشنبیریی، وەك دەزانرێت ئێوە کاری بازرگانی دەکەن و ئەو کاری ئەدەبی و ڕۆشنبیریی، لەم دوو بوارەدا تاچەند ئاگاتان لەکاری یەکتری هەیە؟**

– من ئاگام لەزۆر کار و جوڵەیەکی ئەدەبی و کولتووریی هەیە لەم وڵاتەدا، بەڵام د.عیزەدین بەهیچ شێوەیەک ئاگای لەکارە بازرگانییەکانی من نییە، تەنانەت بۆ سوعبەت هەندێجار دەڵێم ئێمە ئەم هەموو کارە باشەمان بۆ سلێمانی کردووەو ئەو هەموو پرۆژەیە خەڵکانی تر لەسەری دەنووسن بەڵام تۆ نەک لەسەری نانووسیت هەرگیز پرسیاریش ناکەیت بڵێت ئەوە چی دەکەن و خەریکی چین و ئەو پرۆژانەتان چییە؟

جیاوازی کارکردنیشمان ئەو لەو بوارە خوێندی من چوومە کۆلیژی کارگێڕی و ئابوری لە بەغدا ئەم خوێندنەم زەمینەسازی بوو بۆ ئەوەی بتوانم باگراوندێک بۆ کاری بازرگانییەکانم دروست بکەم، من لەسەرەتا لای کۆمەڵێک بەڵێندەر کاری ژمێریاریم دەکرد مانگی بە ٤٠ دینار، چونکە لەسەرەتای ژیاندا ئێمە سەروەت و سامانی باوکمان نەبوو ئەوەی بۆی جێهێشتین تەنها کتێب و زانست بوو، بێگومان دکتۆریش زیاتر بەخوێندن و نووسین و بواری ئەکادیمییەوە سەرقاڵ بوو.

***پەیوەندیت لەگەڵ کتێب و خوێندنەوە چۆنە، بە ٨٠ ساڵ تەمەنەوە تا ئێستا بەردەوام د.عیزەدین کتێب دەخوێنێتەوەو کتێبی لەبەردەستە، ئایا بەجیاوازی کارەکەتانەوە ئێوەش وان؟**

–جارێکیان هاوڕێکم هات وتی دکتۆر عیزەدین زۆر وەسفی کردوویت و وتوویەتی فاروقی برام کتێبێک بخوێنێتەوە دەیکات بە دە کتێب.وتم ئەوە وەسف نییە ئەوە زەمە (بە پێکەنینەوە) چونکە ئەوە مانای وایە من کەم دەخوێنمەوە، واتە من کتێبێک دەخوێنمەوە دەتوانم هێندەی دە کتێب شی بکەمەوە و قسەی لەسەر بکەم. من بەردەوام هاوڕێی کتێب بووم لە هەموو قۆناغەکانی تەمەنمدا بە ئێستاشەوە، تەنانەت لە کۆمپانیا و ئۆفیسەکەم سەیر بکە بەردەوام کتێب لە ژوورەکەمدا هەیە، و لێرە و لەماڵەوە زیاتر لە ٤ هەزار کتێبم هەیە، خوێندنەوەی کتێبەکانیش هەمەجۆرن و لەهەموو بوارەکاندا دەخوێنمەوە.تەنانەت خانویەکی تازەم کردووەتەوە شوێنێکی زۆر گەورەم داناوە بۆ کتێبخانە، بەڵام ئەوە شتێکی بەڵگەنەویستە ڕەنگە من نەتوانم وەک د.عیزەدینی کاکم بخوێنمەوە لەبەر ئەوەی ئەو هەموو تەمەنی خۆی داناوە بۆ خوێندنەوە و نووسین و ژیان لەگەڵ کتێبدا.

***یەكێك لەو ڕەخنانەی لە تۆ و د.عیزەدینی برات دەگیرێت ئەوەیە ئێوە هیچ کامتان نەتان توانیوە چەند دەستنوسێکی بە نرخی باوکتان چاپ بکەنەوە، بۆ نمونە تەفسیری قورئانی هەیە بۆ تا ئێستا لە کتێبخانەکەیدا کەوتبێت و ئێوە چاپی ناکەنەوە، ئەمە پەیوەندی بە بیروبارووەڕی ئێوەوە هەیە بۆ کتێب و بەرهەمەکانی باوکتان؟**

– نەخێر هیچ پەیوەندی بەوەوە نییە، ڕەنگە کەمێک کەتەرخەمییەکە لای کاکمەوە بێت، بەڵام ئەویش هێندە پرۆژە و کتێب و نووسینی خۆی هەبێت کەمتر بیپەرژێتە سەر ئەو شتانەی باوکی ڕەحمەتیم، تەنانەت لە زۆر ئیشی ئەویشدا من زۆرجار گلەییم لێکردووە و تومە بەدەر لە کتێبەکانی باوکم تۆ کتێبی (مێژووی ئەدەبی کوردی) یەکەت چاپ بکە، چونکە ئەوە دەبێتە سەرچاوەیەکی باش بۆ خوێندنی ئەکادیمی لە کوردستان و زانکۆکاندا، بەڵام وەک وتم ئەویش ئەوەندە پڕ ئیشە تا ئێستا نایپەرژێتە سەر ئەوانە، من نەک کتێبی باوکم هی نووسەرانی تریشم چاپکردووە و هاوکاریم کردوون بۆ چاپکردن. بەڵام شتێک هەیە دەمەوێت لەسەر دەستنووسی تەفسیری قورئانەکەی باوکم باس بکەم ئەویش ئەوەیە کە تەفسیرەکەی تەواو نەکرد و کۆچی دوایی کرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەمووی نەکردووە لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە هەر بۆی چاپ دەکەین. چونکە بە کوردییەکی زۆر پاراو تەفسیری قورئانی کردووە، هەروەک چۆن ئەگەر سەیری گوڵستانی سەعدی بکەین دەبینین بە کوردییەکی زۆر جوان کردوویەتی بەکوردی، بەتایبەتی بۆ ئەو کاتە زۆر گرنگ و پڕ بایەخ بووە. باوکم کتێبی ڕابەری نوێژی هەیە، ڕابەری حەجی هەیە هەموو ئەوانەمان چاپ کردووەتەوە، بەڵام هەر سوریشین لەسەر ئەوەی ئەگەر دوو (جوزئ)یش بێت تەفسیری قورئانەکەی هەر چاپی دەکەین. چونکە دەبینین ئێستا ئیسلامییە میانڕەوەکان زۆر سەرسامن بە بیروبارەڕ و بۆچوونەکانی باوکم و سود لە کتێب و بەرهەمەکانی وەردەگرن، چەندین مەلای خوێندەوار هەیە لەم سەردەمەدا سوود لە کتێبەکانی باوکم دەبینێت.



د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ - فاروقی مەلا مستەفا
سلێمانی جەژنی قوربان ١٩٤٨







د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ - مۆسکۆ

- لەمنداڵیدا:
ماڵێک لە کتێب و ئەدەبیات و گفتوگۆی گەرم، لەنێو ئەو دونیا جوانەدا چاوی هەڵهێنا.

- لەگەنجیدا:
دکتۆر عیزەدین کوڕی مەلا سەفوەتی شاعیرە، لەگەنجیدا و لەنێو گەنگەشە گەرمەکانی ئەوسای فیکرو ئایین و ئەدەبیاتدا، ئەدەب هەڵدەبژێرێ و دواتر بەلای (چەپ) دا رێ دەکات، لێ هەرگیز دژی ئایین نەبووە و، قووڵتر لەهەندێ کۆلکە مەلای ئەوسا رۆچۆتە نێو دونیای ئایین.

- د. عیزەدین، بڵندتر لەسیاسەت
هەر زوو تێکەڵی دونیای سیاسەت دەبێ، لێ لە هەموو قۆناغەکانی ژیانیداو لەهەر کوێ بووبێ، بڵندتر لەسیاسەت راو رەخنە و روانینەکانی خستۆتەروو، بۆیە بەردەوام لەگەڵ سیاسیەکاندا لەشەڕو ململانێدا بووە، چونکە ئەو لە ئاستانەیەکی بڵندترەوە لەژیان و سیاسەتی دەڕوانی.

- بڵندترین بڕوانامە
بۆ ئەوسا، کە ئەو قوتابی ماستەر بوو، دواتریش و تا گەیشتۆتە دکتۆرای ناوک، د. عیزەدین بڵندترین بڕوانامەی لەبواری خوێندندا هەبووە، ئەو نەیدەخوێند بۆ بڕوانامە، بەڵکو دەیوست لەو گەڕانە زانستییە پڕ نهێنی و چێژدارەدا بەردەوامبێ، چونکە ئەو دەیزانی گەوهەرەکان وا لە ژێر زەویدا و زەویش گەڕانی پڕ عیشقی دەوێ.

- گەڕان جوگرافیای دوور
د. عیزەدین یەکێ لەو کەسایەتیە گرنگانەی کوردستان کە جوگرافیایەکی زۆر دوور و جیاوازی بڕیوە، ئەو لەهەر جوگرافیایەک بووبێ مشتێ لەخۆڵی نیشتمانی جێهێشتووە، ئەزموونێکیشی دەگەڵ خۆیدا بۆ ئەم میللەتە هەژارەی خۆمان هێناوەتەوە.

- نەتەوەیبوون
لەسلێمانیەوە، بیری لەهەولێر و قامشلۆ و مەهاباد و ئامەدە، لەبەغدا بوو بە هەوای چیاکانی کوردستانەوە شەوی دەخستەوە سەر رۆژ و رۆژی پڕ دەکرد لە گفتوگۆی گەرم، تایبەت لەگەڵ قوتابی و مامۆستا کوردەکان، ئەو یەکەمین کەسە لە سلێمانیەوە بەرەو باکوور بچێ و دکتۆرا لەسەر ئەحمەدی خانی بنووسێ، ئاخر ئەم هەنگاوە بۆ ئەوسا و ئێستاش هەنگاوی گەورەیی نەتەوەیین و بە گەورەیش دەخوێندرێنەوە.

## - فرەیی بەهرە، لێکۆڵینەوە

پرۆفیسۆر عیزەدین مستەفا رەسوڵ لە زۆر بواردا بەهرەی هەیە، دەکرێ بڵێم لەهەموو بوارە ئەدەبیەکانیشدا دەتوانێ قەڵەمی لێوەگەڕخاو بەرهەمی جوان بنووسێ، لێ ئەو خۆی بەشیعرو چیرۆک و رۆمانەوە خەریک نەکرد و، چووە نێو بواری توێژینەوەو قووڵبوونەوەی زانستی، لەوەشدا چاکی کرد، چونکە کورد ئەدیبی زۆرە و لێکۆڵەری کەم، تایبەت لێکۆلینەوەی جدی!

## - سەخاوەت و سادەیی

لەسەخاوەتدا، هەمیشە حەز دەکات ئەوەی دەیزانێ بیداتە ئەوانیتر، لەسادەیشدا گەروەتر لە پێناسەی سادەیی و، زووتر لەوادەی خۆی دەچێتە وڵاتەوە.

## - زاکیرە، یان گەنجینە

زاکیرەی ئەو بەتەنێ شریتی گێڕانەوەی رووداو و بەسەرهات و دیققەتی کات و سات و ژمارە و کەسەکان نیە، بەقەد ئەوەی گەنجینەیەکەو دەکرێ وەک پاژێکی گرنگی مێژوویی کلتووریی سوودی لێوەربگیرێ، چۆن و کەی؟ ئەمە پرسیارێکە و بەکراوەیی دەیهێڵمەوە.

## - تووڕەییەکانی

ئەوانەی لە نزیکەوە دەیناسن، دەزانن تووڕەییەکانی سپین، هەرکێش لێی تورە بێت حەز دەکات رۆژێک زووتر لەگەلێدا ئاشت بێتەوە.

## - تەمەن، نەوەستان

تەمەن لای دکتۆر هەڵدەکشێ، لێ هەڵکشانێکی ترسنۆک، چونکە ئەو بەردەوام کار دەکات، دەنووسێ، بۆ ساتێ ناوەستێ و، نەوەستانی دکتۆر ئەژنۆی هەڵکشانی ترسنۆکانەی تەمەنی شکاندووە.

## - لووتکە، پێشنیاز

ئێستاکە ئەم چەند پەیڤە کورتە دەنووسم، دەزانم قسە لەکەسایەتییەک دەکەم کە (لووتکەی ئەدەبیاتی کوردییە) بۆیە پێشنیاز دەکەم سەرۆکایەتیەکانی هەرێمی کوردستان، روو لە نووسەرو لێکۆڵەر و بیرمەندە گەورەکانی وڵاتەکەیان بکەن و فەرامۆشیان نەکەن، چونکە لەو نێوەندەدا فەرامۆشییەک دەبینرێ و سارد سارد هەموومان ئازار دەدات!.



د. عیزەدین- مەلا بەختیار- مام جەلال- د. کەمال فوئاد



د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ - سالار عوسمان



لەڕاستەوە: حەسەن عەمرۆ- خالید بەگداش- د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ- عەبدولوەهاب ڕەشوانی
شام ١٩٩٣



# من و پرۆفیسۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ

د. جەمشید حەیدەری

بێگومان گەر مرۆڤ بخوازێ لەسەر ئەو زانا گەورەیە بنووسێ، پێویستە چەندان لاپەڕە پڕ بکاتەوە و هەر تەواو نابێ، چونکە مرۆڤێکی فرە شارەزا و پسپۆڕە لە بوارەکانی ئەدەبیاتدا، نەک ئەدەبیاتی کوردی، بەڵکو ئەدەبیات بەگشتی.

دکتۆر ئەسپی خۆی لە زۆر بواردا تاوداوە، لێکۆڵینەوەی زانستی، فۆلکلۆر و وەرگێڕان، جگە لەسەرپەرشتی دەیان خوێندکار لە پلەکانی ماستەر و دکتۆرادا.

بێگومان پرۆفیسۆر عیزەدین مستەفا، مرۆڤێکی بەتوانا و لێهاتووە، من لەو وتارەمدا تەنیا باسی هاوڕێیەتی و دۆستایەتی خۆم و بنەماڵەکەم و بە تایبەتی پەیوەندی هاوڕێ شەهید جەمال حەیدەری و دکتۆر عیزەدین دەکەم.

لە ساڵانی ١٩٥٩ – ١٩٦٠ بەرلەوەی دکتۆر بەرەو سۆڤیەتی پێشوو بڕوا، جار و بار من چاوم بە دکتۆر دەکەوت لە نووسینگەی ڕۆژنامەی (اتحادالشعب و ئازادی) دا، بەڵام ناسیاوی ڕاستەوخۆم لەگەڵیا نەبوو. دوای ئەوەی دکتۆر لە باکۆ گیرسایەوە بۆ خوێندن، پێشەکی بۆ ڕۆمانی "پێشمەرگە"ی دکتۆر ڕەحیمی قازی نووسی و "پێشمەرگە" لە بەغدا چاپکرا، من لە ڕێگای ئەو پێشەکییە، ئەوم ناسی.

لە ساڵی ١٩٦٦ کە چووم بۆ مۆسکۆ، دکتۆر خوێندنی



تەواو کردبوو، لە مۆسکۆ چاوم پێکەوت و تازە نامەی دکتۆراکەی لە بەیروت چاپکرابوو لەسەر "ڕیالیزم لە ئەدەبی کوردیدا" بە دەستخەتی خۆی پێشکەشی کردم، بەڵام لە ١٩٦٨ کە گەڕامەوە وڵات، کتێبەکە کەوتە لای پرۆفیسۆر جەلیلی جەلیل. لەوکاتەوە ڕاستەوخۆ من ئاشنایەتیم لەگەڵ دکتۆر عیزەدین پەیدا کردووە.

دیارە پەیوەندی دکتۆر عیزەدین لەگەڵ شەهید حەیدەری برام، دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو، وەک دکتۆر عیزەدین لە یەکێک لە ژمارەکانی گۆڤاری "بەیان" ئاماژەی پێدەکات. لە سەرەتای پەنجاکان، دکتۆر دەستگیر کراوە لەلایەن ڕژێمی پاشایەتی و ڕەوانەی زیندان کراوە، لە زینداندا لەگەڵ شەهید جەمال یەکتری دەناسن وەک دکتۆر ئاماژەی پێکردووە، شەهید جەمال هانی داوە بە کوردی بنووسێ و گرنگی بە ئەدەبیاتی کوردی بدات. دکتۆر عیزەدین زۆرجار ئاماژە بە کاریگەری شەهید جەمال دەکات لەسەر خۆی، هەر ئەوەش وای لە دکتۆر کردووە لە نامیلکەی "ڕازی دووری" شیعرێکی بۆ شەهید جەمال بڵاوکردۆتەوە، هەروەها لە ساڵانی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو، شیعرێکی تری بە زمانی عەرەبی لەژێر سەردێڕی "شئ من الوجد"ی لە ڕۆژنامەی "بیری نوێ — الفكر الجديد"دا بڵاوکراوەتەوە.

دکتۆر دوای تەواوکردنی خوێندنی ئەکادیمی و پاشان ئامۆژگاری کادیران لە مۆسکۆ، گەڕایەوە کوردستان و لێک دابڕاین. لە کۆتایی ١٩٦٨ گەڕامەوە بەغدا، لەو کاتەدا حیزبی شیوعی لەت ببوو (ل. م — لیژنەی مەرکەزی و ق. م — قیادەی مەرکەزی) من و دکتۆر هەردووکمان لایەنگری(ق. م) بووین، بەڵام من تا لە بەندیخانەی "قصر النهایە" دەرنەچووم، دکتۆرم نەبینییەوە، لە حوزەیرانی ١٩٦٩ لەگەڵ دکتۆر یەکتریمان بینیەوە و لە گۆڕەپانی "التحریر" وێنەمان گرتووە.

دوای ڕێکەوتنی ١١ ی ئاداری ١٩٧٠، بۆ جارێکی تر ڕووم لە سۆڤیەتی پێشوو کرد بۆ خوێندن، لەگەڵ دکتۆر لێک دابڕاین.

لە ساڵانی ١٩٧٦ — ١٩٧٧ دکتۆر عیزەدین هات بۆ سۆڤیەت بۆ نووسینی تێزی دکتۆرای دووەمی "دکتۆر نەووک" من ئەو کات خوێندکاری دکتۆرا بووم لە لێنینگراد. دکتۆر کە هات نیازی هەبوو تێزەکەی لەسەر "ڕیالیزمی سۆسیالیستی لە ئەدەبی کوردیدا" بنووسێ. من لەگەڵ ئەو بۆچوونە نەبووم کە لە ئەدەبی کوردیدا ڕێبازی ڕیالیزمی سۆسیالیستی بوونی هەبێ، بەڵکو بیری سۆسیالیستی و دادپەروەری لە ئەدەبی کوردیدا هەیە، بەڵام وەکو ڕێباز بوونی نییە. ڕاستە چەند نووسەرێکی هەڵگری بیری سۆسیالیستی — مان هەیە وەک: عەبدولواحید نوری، گۆران، دڵزار و مارف



د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ - جەمشید حەیدەری - بەغداد ١٩٦٩

بەرزنجی، بەڵام ڕێبازێکی نوێ لەدایک نەبووە.
ئێوارەیەک لە بەشی ناوخۆی ئەکادیمیای زانستی سۆڤیەت – ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی ئێمە "من و دکتۆر عیزەدین و پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ – کوردۆییڤ" لە ژوورەکەی من ڕۆنیشتین باسی تێزەکەی بکەین. پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ پێشنیازی کرد بۆ دکتۆر عیزەدین لەسەر "ئەحمەدی خانی" بنووسێ و مامۆستا گوتی: پێویستە خانیەڤیدینا – خانی ناسی" هەبێ. دکتۆر عیزەدین ڕایگەیاند کە ئەو (١٣) ساڵە لە زانکۆدا لەسەر خانی کار دەکات و کتێبێکی بە زمانی عەرەبی ئامادەیە. مامۆستا کوردۆ ئەو باسەی لەسەر (خانی)ت بە عەرەبی نووسیوە بکە بنەما بۆ تێزی دکتۆرای نەووک. ئەوەی شایانی باس بێت – ئەحمەدی خانی و مەم و زین- لەلایەن زانایانی ڕۆژهەڵاتناسیی ناسراو بوو، چونکە "مەم و زین" کرابووە ڕووسی و نامەی دکتۆرای مارگریتە بارسیۆڤنا، دینکۆ لەسەر نووسرا بوو. ئەکادیمی ئۆربیلی "خانی" لە ڕیزی دوو گەورە شاعیری ڕۆژهەڵات دانابوو "حافیزی فارسی و شەتا ڕۆستەڤیلی گورجی". دکتۆر عیزەدین ئامۆژگاری پرۆفیسۆر کوردۆی وەرگرت. لەو ماوەیەی دکتۆر لە مۆسکۆ بوو، من جاروبار سەردانم دەکرد و شەویش لەلای دەمامەوە.
دکتۆر چەند جارێک هاتۆتە لێنینگراد و لە ماڵەوە پێکەوە لەگەڵ خوالێخۆشبوان دکتۆر کاوس قەفتان و دکتۆر ئەنوەر دڵسۆز پێکەوە تا درەنگانێک دانیشتووین و گفتوگۆی هەمەجۆرمان کردووە، هەروەها لە مۆسکۆ لە بەشی ناوخۆی ئەکادیمیا لەلای دکتۆر جەبار قادر و دکتۆر شوکریە ڕەسووڵ و دکتۆر کوردستان موکریانی و دکتۆر جەرجیس حەسەن باسی هێمن و هەژار و قزڵجی – مان کردووە تا دەگاتە برجنیڤ و خالید بگداش.
دکتۆر عیزەدین مرۆڤێکی بەسەلیقە و زیرەک و خوێندەوارێکی باشە و خاوەن زاکیرەیەکی زیندووە.
دوای ئەوەی دکتۆر عیزەدین دکتۆرای نەووکی وەرگرت گەڕایەوە بەغدا، دیسان لێک دابڕاین تا تەمووزی ١٩٩١ و لە شەقڵاوە یەکتریمان گرتەوە. وەک کاک فوئاد، هۆگری بەرپرسی نهێنی حیزبی شیوعی لە هەولێر ئاماژەی پێدەکرد، لە ڕاپەڕینی هەولێر، دکتۆر عیزەدین ڕۆڵی گێڕاوە. من لە تەمووزی ١٩٩١، دوای ڕاپەڕین گەڕامەوە کوردستان، ئەوکات دکتۆر عیزەدین لە شەقڵاوە لە ماڵی هاوڕێ کەریم ئەحمەد دەژیا، چەند جارێک پێکەوە لەگەڵ کاکە حەمەی مەلا کەریم دانیشتووین و بیروڕامان ئاڵوگۆڕ کردووە، ڕەنگە هەندێ بۆچوون و هەڵسەنگاندنمان وەک یەک نەبووبێ و جیاواز بووبێ، بەڵام بەگشتی جیهانبینیمان یەک بووە.
لە ساڵی ١٩٩٤ بوومە سەرۆکی بەشی کوردی کۆلێژی ئاداب و دکتۆریش ئەندام پارلەمانی کوردستان بوو، لەبەر ناکۆکی نێوانی لەگەڵ خوالێخۆشبوو پرۆفیسۆر مارف خەزنەدار، لە دەرس وتنەوە بێ بەش کرابوو، بەڵام لەبەرئەوەی دکتۆر شارەزاییەکی باشی لە ئەدەبی نوێی کوردی هەبوو، نەدەکرا خوێندکاران بێبەش بکرێن لە ئەزموون و توانای دکتۆر عیزەدین، بۆیە مافی خۆی بوو، دەرسیش بداتەوە و سەرپەرشتی ماستەر و دکتۆراش بکات، منیش وەک سەرۆک بەش، ئەو مافەم بۆ گەڕاندەوە.
پێموایە دکتۆر عیزەدین مستەفا، یەکێک لە گەورە زاناکانی ئەدەبیاتی کوردی لە هەموو کوردستان. لە ناخەوە تەمەن درێژی بۆ دەخوازم و هیوادارم درێژە بە نووسینی مێژووی ئەدەبی کوردی بدات و بەرگەکانی تریش تەواو بکات. لەگەڵ ڕێزی تایبەتیم.





# پ. د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ زانایەکی ناودارو فرە بەهرە

**د. کەمال غەمبار**

بەدەگمەن لە وڵاتێکی جیهانی سێیەمدا، کەسێک هەڵدەکەوێ کە ڕووبەرێکی فراوانی لە بواری ئەدەب و ڕۆشنبیریدا داگیر کردبێ و ئامادەییەکی دیار و بەرچاوی هەبێ و بەرهەمەکانی بەدەمی خۆیان هاوار بکەن و بڵێن ئا ئەوە ئێمەین و بۆ ئەوانەی بە دوای زانیاریدا دەگەڕێن، ببنە سەرچاوەی دەوڵەمەند و بەپێز و بە کەڵک و، بوونی ئەو جۆرە کەسانە وەک سامانێکی نەتەوەیی لە قەڵەم بدرێن و، لەناو ناوەندەکانی ئەدەب و ڕۆشنبیریدا بە زانا بناسرێن و ناو دەرکەن، پسپۆرییەکەیان پلە و پایەیەکی باڵایان پێ ببەخشێ، وەک پرۆفیسۆر دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، کە یەکێکی وەکو منی خاوەن تەمەن و ئەزموون پتر لە پەنجا ساڵە لە نزیکەوە دەیناسم و ئاشنایەتییەکی توند و تۆڵم لەگەڵیدا هەیە، بەر لەوماوەیەش زانیاریم لەسەر ژیانی هەبووە.

بەر لەوەی دکتۆر عیزەدین وەک کەسێک بەگۆشت و خوێنەکەی بناسم، لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی وەرگێڕانی دوو شیعری کوردی بۆ سەر زمانی عەرەبی ناسیومە، کە یەکێکیان شیعرێکی «عەلی فەتاح دزەیی» بوو بەناوی «ئەی کوردی چۆغە لەبەر» کە لە گۆڤاری (الادیب) ی لوبنانی بڵاوی کردبۆوە بەر لە شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨

ئەو کاتە دکتۆر عیزەدین و عەلی فەتاح دزەیی لە شام بوون و لە زانکۆی دیمەشق دەیانخوێند، ئەو ناسینەی دکتۆر لەڕێگەی خوێندنەوە بوو ، ناسینی دووەم لەڕێگەی ئێزگەی ڕادیۆی

بەغدا بوو کە هەر لە دوای شۆڕشی چواردەی تە مووزەوە بەماوەیەکی کەم گوێم لە دەنگێکی زوڵاڵی بەجۆش و خرۆش دەبوو کەهانی جوماوەری دەدا کە پشتگیری لە شۆڕش بکە ن و لە کۆتایی وتەکانیدا دەیوت ، عیزەددین مستەفا .

جاری سێیەم کە دکتۆرم ناسی دیتنی خودی خۆی بوو لە خانەی باڵای مامۆستایان لە بەغدا کەدوای ماوەیەکی کەم ناوەکەی گۆڕاو کرا بە کۆلیژی پەروەردە ، دیار بوو دکتۆر عیزەددین لە شام گەڕابۆوەو لەبەشی — زمانی عەرەبی و ئەدەبیات لە پۆلی سێیەم وەرگیرابوو ، منیش یەکەم ساڵم بوو لەو کۆلێژەداو لە بەشی زمانی عەرەبی و ئەدەبیات ، ئەو ساڵە ژمارەیەکی زۆر لە کوردی کچ و کوڕ وەرگیپران و بەرە بەرە لەیەکتر نزیک دەبووینەوەو ئاشنایەتیمان لە گەڵ یەکدا پەیدا دەکردو دەبووینە هۆگری یەکتر، دیارترین کەس لەناو کوردەکاندا کە ئاماژەی پێدەکرا خوێنکارێکی چوست و چالاک بوو و ئیمە پێی سەرسام بووین ، چونکە نووسەرێکی دیار بوو و لە چەندین رۆژنامەدا بەناوی خۆی و ناوی خوازراوە بە زمانی کوردی و عەربی دەینووسی و لە هەنێکیاندا لە دەستەی نووسەران بوو، بۆنموونە بەناوی : مامەند، هاوار. لە ڕۆژنامەی (ئازادی والحضارە) لەدەستەی نووسەران بوو هەروەها لە ڕۆژنامەی( صدی الاهالی ولاتحاد الشعب) بابەتی بڵاو دەکردەوە، جگە لەنووسین شیعرەکانی عبدالوهاب بەیاتی دەکردە کوردی و هی مامۆستا گۆرانیشی دەکردە عەرەبی و بڵاوی دەکردنەوە، هەرچەند کەمن بابەتی کورتم بەتایبەت شیعری عەرەبی دەکردە کوردی بەڵام یەکەمین ئەزموونم لە وەرگێڕانی درێژدا بابەتێکی ئابووری بوو کەدکتۆر عیزەدین لەگۆڤاری «الشرق»وەریگتبوو لە قاهیرەدا دکتۆر محمد مەندوور دەری دەکرد، داوای لێکردم کە بیکەمە کوردی و وەرمگێڕا.

بۆ دەستپاکی ئەدەبی کابرایەکی تورکمان کتێبێکی بە عەرەبی لە سەر کورد دەرکردبوو، بە خراپ لە گەلی کورد دوابوو، دکتۆر عیزەددین کتێبەکەی دایە ( دکتۆر کەمال مەزهەر) کەبە کوردی بەرپەرچی نووسەرەکە بداتەوە ئەویش بۆی دەکاتە عەرەبی و ئەڵقە بە ئەڵقە لە ڕۆژنامەی (صدی الاهالی) بۆی بڵاودەکردەوە .

ساڵی خوێندنی ١٩٥٨- ١٩٥٩ فیستیڤاڵیکی براژی ئاشتی لە مووسڵ ڕێکخرا ئێمەش بە خوێنکارانی کۆلیژی پەروەردە بە شەمەندەفەر چووین بۆبەشداریکردن لە میهرەجانەکە، کەلە گۆڕە پانێکدا خەڵکێکی زۆر کۆببونەوە، ئەندامی باڵای براژی ئاشتی لە عێراق پارێزەر «کامل قازانچی» وتارێکی لە کۆبوونەوەکەدا پێشکەش کرد، وادیاربوو کە ڕەوشەکە پشێوبوو، ئەوە بوو کە لەدوای گەڕانەوەی ئێمە بۆ بەغدا کودەتاکەی (عبد الوهاب شواف ) ڕوویدابوو، لە ئەنجامدا کامل قازانچی شەهیدکرا بوو، کە هەواڵە دڵتەزێنەکە بڵاوبۆوە گردبونەوەیەک لەکۆڕەپانەکەی کۆلێژدا کرا دکتۆر عزەدین چووە سەر پردەکەی هێڵی شەمەندەفەر کە کەوتبووە نێوان گۆڕپانەکەو یانەکەی کۆلێژەکە،

وتارێکی لەبەر بەدەنگێکی بەجۆش وخروش و بەعەرەبییەکی پاراو و ڕەوان پێشکەشکرد کە هەموو خوێنکارانی هەژاندو سەیرم کرد، ڕاگری کۆلێژیش سەرسامی وتارەکەی بوو، ئەوەی کەلە بیرم ما بێ دوای ماوەیەک دکتۆر عزەدین لەپۆلی سێیەمەوە گوێزرایەوە بۆ پۆلی چوارەم .

دوای دەرچوونی لە پۆلی چوارەم ، دەرگا کرایەوە بۆناردنە دەرەوەی ژمارەیەک خوێندکار بۆ یەکێتیی سۆڤیەت کە دکتۆر عیزەدین یەکێک بوو لەو کەسانە، ئەو کاتە دکتۆر صدیق ئەتروشی بەڕێوەبەری گشتیی دیراسەی کوردی بوو، من وهاوڕێ ئیسماعیل خۆشناو چووینە فرۆکە خانەی بەغداو دکتۆر عیزەدینمان بەڕێکردو، ئەوماوەی کەلە سۆڤیەت بوو گۆرینەوەی نامەی نێوانمان بەردەوام بوو ئەو کاتانە نەبێ کەڕەوشەکە ناهامواربوو، کەنامەی بو فاروقی برای دەنارد لە ڕەوشی منی دەپرسی و لەبەر تێکچوونی ڕەوشەکە بە خەستەخانە ناوی دەبردم .

ساڵی ١٩٦٤ کە گەڕایەوە ولات، دکتۆراکەی لە شاری (صەیدا) ی سەر بە لوبنان بەیارمەتی (بڵند حەیەری) چاپ کردبوو کەدانەیەکی پێ بەخشیم بەلامەوە فەتحێکی نوێ بووو، کە تا ئەمڕۆ بە سەرچاوەیەکی بە پێزی ئەدەب و ڕەخنەی ئەدەبی کوردی لە قەڵەم دەدرێ.







دوای چەند ساڵێک دەرس وتنەوە لە کۆلیژی ئەدەبیات – بەشی کوردی لە بەغدا بۆ وەرگرتنی باوەڕنامەی ناووک باسە بە پێزەکەی لە گەڵ خۆی هەلگرت و ڕووی کردە یەکێتی سۆفیەت لەوێدا وتووێژێکی قووڵ و درێژ خایەنی لەسەر کراو لەبەرگرنگی تۆژینەوەکە کە زۆر بەنرخ و بەها نرخێنرا و بەو بۆنەیەوە ڕۆژی وتووێژکردنەکە لەسەر لێکۆڵینەوەکە ناونرا «ڕۆژی کوردستان « کە تا بڵێی لێکۆڵینەوەکی باڵا بوو وکە بە ناوی « أحمدي خاني شاعراً ومفكراً وفيلسوفاً» بوو، بە پێی میتۆدی فەلسەفەی ماتریالیزمی دیالێکتیکی باسەکە داڕێژرابوو، لەڕووی ئەدەب و ڕەخنەی ئە دەبییەوە نرخ و بایەخی خۆی هەبوو و هەیە.

دکتۆر عیزەدین بە پێچەوانەی زۆربەی زۆری مامۆستایانی زانکۆ دەرس وتنەوە لە نووسینی بەرهەمی هەمەجۆر و وەڕگێڕانی بە سوود دووری نەخستۆتەوە، بەڵکو لەوتەمەنە شیدا بەردەوامەو دەبێ بڵێین خەرمان بەرەکەت، ئەو سەر پەرشتی چەندین نامەی ماستەر و تێزی دکتۆرای کردووە و هێشتاش هەر بـەردەوامـە، هەروەها سەرۆکی چەندین لیژنەی وتوۆیژ بووە و بەشداری لە وتووێژکردووە، وەکو وتم لەنوسینیشدا نەوەستاوە، بەپێچەوانەی « محەمەد فەیزی زەهـاوی « کەلێیان پرسی بۆ بەرهەمی نووسراوت نییە وەڵامەکەی ئەمە بوو:

عاق تدريسي عن التأليف لكن    من تلاميذي ألّفت مؤلَّف

ڕەنگە نەتوانین بەوردی بەراورد لەنێوان دوو زانا بکەین، زانایەکی ئەدەبی و ڕۆشنبیر، کە دەرسی بەسەدان خوێندکار وتووە و پێی گەیاندوون و لەسەر دەستی ئەودا دەرچوون و زانایەکی ئاینی وەکو محەمەد فەیزی زەهـاوی کەتەنیا ژمارەیەکی کەم بەراورد لە گەڵ دکتۆر عیزەدیندا دەرسیان لاخوێندووە و مۆڵەتی مەلایەتیان وەرگرتووە، کەچی دکتۆر عیزەدین لەنگەری هەردوو لای ڕاگرتووە و، بۆنموونە جگە لە پێگەیاندنی بەسەدان کەس زیاتر لە (٨٠) چاپکراوی هەیە کە کتێبخانەی کوردی و عەرەبی دەوڵەمەند کردووە، ویرای ئەوەی لە سیمینار پێشکەشکردن لە کۆڕو کۆبوونەوە و فێستیڤالەکان لە کورستان و عیراق و دەرەوەی وڵاتدا بوونی خۆی و پسپۆڕی و شارەزایی خۆی نواندووە و لە بواری ڕۆژنامە نووسی و بواری ئەدەبیاتدا رۆلی بەرچاوی هەبووە بۆ ماوەیەکی زۆر سەرۆکی یەکێتی نووسەرانی کوردبووە، بەهۆی زۆری بەرهەمە بەپێزەکانی و ڕۆڵی دیاری لەبواری ڕۆشنبیریدا چەندین خەڵاتی ڕێزلێنانی لەناوەوە و دەرەوەدا پێدراوە، دەبێ ئاماژە بەڕاستییەک بکەم کە بەدەگمەن کەسێک هەڵدەکەوێ کەتا ئەو تەمەنەی گەیشتوویەتێ ئاوا بە سەلیقەو بیر تیژبێ، لەتەمەنێکی بچوکیشدابوو کەنیشانەی زیرەکی و ژیری لێ دەرکەوتبێ، بۆ سەلماندنی ئەو بۆ چوونەشم جارێکیان «مەلا شکوور» لە کۆڕێکی گەورەدا وتی : ئێمە گەورەو تەواو بووین کەچی دکتۆ عیزەدین منداڵکار بوو بەڵام لە ئێمە عاقڵ تربوو.

خۆ ئەگەر باسی لایەنی سیاسبی دکتۆر بکەم وەک لەنزیکەوە شارەزاییم هەبێ و زانیاری وەرگرتن لەخەزوورەکەم، کە سەرەتا لە قەڵادزە بە مامۆستای سەرەتایی دامەزرابوو و هەر زوو چوو بووە ناو کۆڕی سیاسی و خەباتکردن ،بەرپرسی ڕێکخستنەکانی پارتی کۆمۆنیست بووە لەو شارەو کە شۆڕشی ئەیلوول ساڵی ١٩٦١ بەرپابووە و ساڵی ١٩٦٤ لە یەکێتی سوڤیەت گەڕابۆوە وڵات و پەیوەندی بە بارەگەی بارزانی نەمر کردبوو و ئامادەباشی خۆی دەربڕیبوو کە خزمەتی شۆڕش بکات.

وەکو من لە نزیکەوە بیناسم هەمیشە کوردایەتی کردووە و لەدەرەوە و ناوەوەدا داکۆکی لە دۆزی ڕەوای گەلی کورد کردووە و نووسینەکانی و سیمینارەکانی لەدەرەوەو ناوەوەدا بەڵگەو گەواهی قسەکانمن.

لێرەدا دەوەستم و دەڵێم تەرخانکردنی ژمارەیەکی تایبەتی (ڕۆڤار) بە» فرۆفیسۆر دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ» تەنیا ئاوڕ دانەوە و ڕێزلینان نییە لە خودی ئەو زاتە بەقەد ئەوەی ڕێزلێنانە لە ئەدەب و ڕۆشنبیریی کوردی و عەرەبی کە خزمەتێکی گەورە و بەرچاوی پێشکەش کردووە و بە هەموو شێوەیەک شیاوی ڕێز لێنانەو زیاتریش ، لە گەڵ هیوای تەندروست باشی و تەمەن درێژی «پ.د. عیزەددین»دا .






# ئەلبومی وێنەکان

**ڕۆڤار**

ئەلبومی وێنەکان، کتێبێکی قەبارە گـەورەی ڕەنگاو ڕەنگە لە دوو توێی ١٨٢ لاپـەڕەدا بە نەخشەسازییەکی سەرنجڕاکێشەوە لەلایەن ڕۆژنامەنووس جەمال لۆلۆوە ئامادەکراوە، ئەم کتێبە ئەلبومە زیاتر لە ٣٥٠ وێنەی سەرجەم قۆناغەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و خێزانی پرۆفیسۆر د.عیزەدین مستەفا ڕەسوڵی تێدا بلاوکراوەتەوە، لەسەر ئەرکی فاروقی مەلا مستەفا چاپکراوە، بە بینینی ئەو وێنە ئەرشیفییە دەوڵەمەندەی بواری خوێندن و سیاسی و گەشت و لایەنە جۆراوجۆرەکانی تری ئەو نووسەرەت بۆ دەردەکەوێت.

ژیانی منداڵی، هەرزەکاری، خوێندنی زانکۆ و خوێندن لە بەغداد و یەکێتی سۆڤیەت، پەیوەندییە سیاسییەکان، وێنە لەگەڵ سەرکردە کوردەکان، وێنە لەگەڵ ڕۆشنبیرە دیارە کورد و عەرەب و ڕوسی و بیانییەکان، وێنە لە شوێنە کولتوورییە گەورەکانی دونیا، وێنەی دایک و باوک، برا و کەسوکار و خێزان و زۆر وێنەی تریش لەم ئەلبومەدا بلاوکراوەتەوە، چاوی ئەم ئەلبوومە دەرخەری قۆناغێکی پرشنگداری د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵە لەژیاندا، بایەخی ئەم ئەلبومە بۆ ئەو کەسانە زیاتر دیارە کە خولیای کەسایەتی ناسین و زانینی ژیانی سیاسی و ئەکادیمی و کۆمەڵایەتی ئەوانن.

یەکێکی تریش لە بایەخەکانی ئەم ئەلبومە لەوەدایە سەرجەم وێنەکان ناوی کەسایەتییەکان و کات و مێژووییان لەسەر نـووسـراوە، ئەمەش هەنگاوێکە بە ئاڕاستەی ئەرشیفکردنی وێنەی کەسایەتییە دیارەکانی کورد و ون نەبوونی ئەرشیفی وێنەییان.

لایەنێکی تری ئەم ئەلبوومە، ژیاننامە و وێستگە گرنگەکانی ژیانی د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵی تێدا خراوەتە ڕوو، لەگەڵ چاوپێکەوتنێکی کورت و خێرا لەگەڵیدا، لەبەشی کۆتایی ئەلبومەکەشدا کۆمەڵێک وێـنـەی دانسقەی کەسایەتییە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرەکانی تیدایە کە بە نووسینەوە وێنەیان نـاردووە بۆی و ئەمیش لەم ئەلبوومەدا بلاویکردوونەتەوە.

لەبارەی بایەخ و کاریگەریی ئەم ئەلبومە لە پێشەکییەکی کورتدا جەمال لۆلۆ دەڵێت «دەمێکە خولیای کۆکردنەوەی وێنەم هەیە، ئەمەش لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە ئێمەی کورد وەک چۆن لەکۆمەڵێک لایەنەوە کەم و کورتیمان هەیە لەم لایەنەشەوە زۆر هەژارین و نە گەلەری و نە مۆزەیەکی تایبەتمەندی وێنەی مێژووییمان نییە، بۆیە بڕیارمدا من لای خۆمەوە هەنگاوێکی سەرەتایی بنێم و دەستپێکی ئەو هەنگاوەش بە وێنە مێژووییەکانی دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ دەست پێبکەم.

لەبارەی هۆکاری دەستپێکردنی ئەم پرۆژەیەش بە ئەلبوومی کەسایەتییەکی وەک د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، لۆلۆ دەڵێت «هۆکارەکەی بۆ سێ خاڵی گرنگ دەگەڕێتەوە، کە ئەوانیش ئەمانەن:

یەکەم: لەبەر ئەوەی دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ پیاوێکی سیاسی ناو ڕوداوەکانە نووسەرێکی دیار و قایمکار و خاوەن ئەرشیفە.

دووەم:لەبەر ئەوەی خۆی دەتوانێت سەرجەم وێنەکانی بەکات و شوێن و کەسەکانی ناوییەوە بناسێتەوە.

سێیەم:وەک پاڵپشتی هەستێکی گیانی بۆ خاوەن ئەرشیفەکە تا خۆی لەژیاندایە ببینێت لەلایەن هاونیشتیمانیانییەوە ڕێزی لێدەگیرێت.

# لەبارەی یاداشتەکانی دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵەوە..!

ڕێبوار جەواد



## *هونەری یاداشت نووسین

هونەری یاداشت نووسین، شان بەشانی هونەرەکانی تری وەک شیعر و پەخشان و ڕۆمان لەدونیای ئەدەبیاتی مۆدێرندا گەشەکردنێکی گەورەی بەخۆوە بینیوە، لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا هونەری یاداشت نووسین جۆرێک بوو لەگێڕانەوەی ڕوداو بەشێوازی هەرەمی و بینای درامی، بەڵام لە ئەدەبیاتی مۆدێرندا ئەم ڕەگەزە وەک هەموو ڕەگەزەکانی تری ئەدەبیات، گۆڕانکاری گەورەی بەسەرهات و شان بەشانی ئەو هونەرانەی تر دواهەمین سنووری کارکردنی خۆی بەزاند و ئێستا لە ڕەخنەی بەراوردکاری و ئەدەبیدا زۆرجار یاداشت نووسین وەک تێکستێکی والا مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت، هەندێجاریش ئاوێنەیەکی ڕوونی ڕووداوەکانی ژیانی نووسەر و ئەو قۆناغە دەردەخات کە نووسەر تێیدا ژیاوە، زۆرجار لە یاداشتی نوێدا تەنها قۆناغێکی دیاریکراوی ئەو کەسایەتییە دەنووسێتەوە کە خۆی مەبەستی بووە، ئەمەش زیاتر لای کەسایەتییە دیارەکانی بواری سیاسەت و بازرگانییە، نزیکترین نمونەش یاداشتەکانی (جۆرج بۆش) سەرۆکی پێشووی ئەمەریکا بەناوی (خاڵی بڕیاردان) جۆرج بۆش وەک سەرۆکێک ئەو چەند ساڵەی حوکمڕانی خۆی وەک سەرۆک دەگێڕێتەوەو چیرۆکی گێڕانەوەکەشی دەیان نمونە و هەڵوێست و شتی چاوەڕواننەکراو و گرنگی تێدایە کە خوێنەر چێژ لەخوێندنەوەی دەبینێ.

بریمەر حاکمی مەدەنی ئەمەریکی لە عێراق، یاداشتی ساڵێکی خۆی لەعێراق بەناوی (ساڵەکەم لەعێراق) وەک یاداشتێکی سەربەخۆ لە کتێبێکدا چاپ کردووە، لەو کتێبەدا بریمەر بەزمانێکی سادە و ساکار دەیان نهێنی ژیانی سیاسی خۆی و ئەو قۆناغەی عێراقییەکان دەگێڕێتەوە. دەیان نمونەی تریش هەیە کە نووسەران و مێژوو نووسان کتێبێکی یاداشتی گەشتنامەیەکی ژیانیان چاپکردووە کە ئەو یاداشتە بەتەنها قۆناغێکی مێژووی ژیانی ئەو نووسەر و مێژوونووسە دەگێڕێتەوە، چێشتی مجەوەرەکەی (مام هەژار) نمونەیەکی پێچەوانەی ئەم یاداشتانەیە و بەزمانێکی سادە و پڕ لەچێژ شەمەندەفەری ژیانی خۆی لە لەدایک بوونەوە تا کۆتاییەکانی ژیانی خۆی خستووەتە ڕوو.

بەڵام ئەوەی لێرەدا دەمانەوێت هەڵوێستەی لەسەر بکەین بەشی یەکەمی یاداشتەکانی پرۆفیسۆر دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسوڵە، کە ساڵی ٢٠٠٦ لە دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بڵاوی کردووەتەوە، پێشتریش من بۆخۆم بەشێک لەو یاداشتانەی دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسوڵم لە گۆڤاری (پەیڤین) خوێندوەتەوە، گرنگە بەوردی هەڵوێستە لەسەر ئەم یاداشتانە بکرێت، وەک ئەوەی پرۆفیسۆر چەند ساڵێک لە زانکۆ وانەی ئەدەبی پێوتووین چەندین سەرنج و تێبینی گرنگی لەسەر هونەری یاداشتنووسین باسکردووە و گرنگە لەم یاداشتانەی خۆشیدا بایەخی بەو هونەرانە دابێت، بەدڵنیاییەوە د.عیزەدین یەکێکە لەو خوێندەوارانەی کورد کە بایەخێکی لەڕادەبەدەری داوە بەیاداشتی نووسەران و کەسایەتییە دیارەکانی دونیا، بۆیە هونەری یاداشت نووسین بۆ ئەو گرنگی و بایەخی خۆی هەیە، لەبەر کۆمەڵێک هۆکار کە دیارترینیان بۆ کاریگەریی و ناوبانگی ئەودەگەڕێتەوە لەنێوەندی ڕۆشنبیریی و سیاسی کورددا، بێگومان باوکی و بنەماڵەکەشی ئەو ناوبانگەیان هەیە، ئەمەش هاندەرێکی باشە خوێنەر بەدوای ئەم کتێبی یاداشتەدا بگەڕێت و بیخوێنێتەوە.

## * لە یاداشتەکاندا چی دەگێڕێتەوە؟

یاداشت نووسین چەند گرنگ و پڕ بایەخ بێت دوو ئەوەندە ئەوە گرنگە نووسەرەکە چی تێدا دەگێڕێتەوە، بەتایبەتیش بابەتی سەرنجڕاکێش و نهێنییەکانی ژیانی خودی نووسەر، چونکە ئێستا لەدونیای ئەدەبیاتدا یەکێک لەو ڕەخنانەی لە نووسەران دەگیرێت لەکاتی نووسینی یاداشتەکاندا هونەری خۆ بە پاڵەوان کردنە. بەو پێیەی ئەو نووسەرە لە یاداشتەکانیدا خۆی وەک پاڵەوانێک پیشان دەدات و خەوش و نهێنی ژیانی خۆی ناخاتە ڕوو بۆ خوێنەرەکانی، ئەمەش پرسیار لای خوێنەر دەوروژێنێت کە ئایا ئەم نووسەرە فریشتە بووە یان مرۆڤ؟ پێچەوانەی ئەم جۆرە لە یاداشت نووسین، ئەگەر سەیری یاداشتەکانی (تۆلستۆی و مەکسیم گۆرکی) بکەین دەبینین دەیان خەوش و نهێنی ژیانی خۆیان بۆ خوێنەرەکانیان خستووەتە ڕوو، لانی کەم بۆ ئەوەی خوێنەر بزانێت ئەم نووسەرە لەکوێوە هاتووە و بۆ کوێ دەچێت.!

سەبارەت بە یاداشتەکانی پرۆفیسۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، ئەوەی خەوش و ڕەخنەیە لەسەری لە بەشی یەکەمدا بەبۆچوونی من دوو لایەنە ئەوانیش: یەکەمیان بریتییە لە شێوازی گێڕانەوەکەی کە بە زنجیرە و ڕوداوەکانی یەک بەدوای یەکدا چنیووە، ئەمەش کەمتر دەرفەت دەهێڵێتەوە بۆ بە هونەرکردن و گێڕانەوەی ڕوداوەکان بەشێوازێکی هونەریی، تەنانەت ئەو دەرفەتەش نادات بەخوێنەر کەمێک یادەوەری لەگەڵ ڕوداوی یاداشتەکاندا بجوڵێنێت.

دووەم ڕەخنە لەسەر ئەم یاداشتانە دکتۆر عیزەدین زۆر بەکەمی باسی خۆی کردووە و زیاتر باسی دەوروبەرەکەی کردووە و چیرۆک و بەسەرهاتی گێڕاوەتەوە و لەشوێنێکی زۆر گرنگیشدا وەستاوە، کە ئەویش ڕۆشتنی بۆ خوێندن بۆ بەغدا و تێکەڵاوبوونی بەکاری سیاسی و ڕۆژنامەنووسی حیزبی شیوعی، ئیتر خوێنەر نازانێت دواتر چۆن چوو بۆ رووسیا؟ کێی لەگەڵ بوو؟بەچەند ساڵ و چۆن فێری زمانی رووسی بوو؟ دکتۆرای ناووکی لەسەر چی بوو؟کەی گەڕایەوە؟ ناخۆشییەکانی ژیانی لە تەراوگە چی بوون؟ یاداشتی

کتێبەکانی بۆ نمونە چۆن دیوانی (گۆران)ی شاعیری چاپ کرد؟دیوانی مەلای جەزیری بەچ ئاستەنگێک چاپکرا؟ ئەمانە و دەیان پرسیاری تر لای خوێنەر جێدەمێنێت و وەڵامەکەی لەم بەشەدا دەست ناکەوێت ئیتر نازانین بەشەکانی تر، خوێنەر هەر چاوەڕوان دەکات، یان بە زووترین کات بەشەکانی تریشی چاپ دەکرێت؟

## * من لەیاداشتەکانمدا.

من لەیاداشتەکانمدا، ئەم دەستەواژەیە زۆر گرنگە بۆ پێوەری هەڵسەنگاندنی یاداشتی هەر نووسەرێک، کارەکتەری بکەری ڕوداوەکان لەناو ئەو یاداشتانەدا چ بەهایەکی گرنگی هەیە، چۆن ڕوداوەکان دەگێڕێتەوە؟بەچ چاوێک یاداشتەکان تۆمار دەکـات؟ لەم یاداشتانەدا د.عیزەدین بکەری سەرەکی و گێڕەرەوەی سەرەکی ڕوداوەکانە .ئەوەی گرنگە لە دەستەواژەی (من لە یاداشتەکاندا) خوێنەر بەوردی ژیانی منداڵی و خێزانی و باری کۆمەلایەتی ئەو دەخوێنێتەوە، بەڵام ئەو گێڕانەوەیەش هێندەی سیاسەتی تێدایە کەمتر لایەنی کولتووری و ئەدەبی تێدایە، ئەمە لەکاتێکدا هەمومان دەزانین دکتۆر عیزەدین زیاتر وەک ئەدیبێک ناسراوە نەک سیاسییەک، هەرچەند ئەو خۆی بە ئەندامی حیزبی شیوعی دەزانێت و دەڵێت زیاتر لە نیو سەدەیە ئەندامی ئەو حیزبەم، بەڵام نەیتوانیوە چاویلکەی سیاسەت لابەرێت و بەچاویلکەی ئەدەب سەیری ڕوداوەکان بکات، هەر بۆنموونە لە گێڕانەوەی ململانێی حیزبی شیوعی و پارتیدا بەتایبەتی تریش (گۆران) وەک شاعیرێکی نزیک لە شیوعی و مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد نزیک لە پارتی، ئەم ململانێیەی نێوان ئەم دوو حزبە و ئەم دوو ئەدیبە پرۆفیسۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ زۆر بەوردی ئاگای لێیە، بەڵام لەیاداشتەکانیدا نەیتوانیووە بیگێڕێتەوە، لەکاتێکدا دەیان هەڵوێست و ململانێی نێوان ئەو دوو حزبەی لە یاداشتەکانیدا تۆمارکردووە، بەبڕوای من باسکردنی ئەو ململانێیە هێندەی تر تام و چێژی بە یاداشتەکان دەبەخشی و زیاتر سەرنجی خوێنەرانی ڕادەکێشا.

ململانێی نێوان پارتی و شیوعی لە قۆناغێک لە قۆناغەکانی کۆمەڵگەی ئێمەدا نەک کاریگەریی لەسەر ڕەوتی ڕووداوە سیاسییەکان، بەڵکو لەسەر کۆی پەیوەندی ئابوری و کۆمەلایەتی و بوارەکانی تری کۆمەڵگە هەبووە، بەڵام لەم یاداشتانەدا دکتۆر کەمتر خۆی لەقەرە داون، ئەمە جگە لەوەی خوێنەر ئەو یاداشتە ٣٠٠ لاپەڕەییە دەخوێنێتەوە هەست بەوە دەکات یاداشتی پیاوێکی سیاسییە نەک ئەدیبێک، لەکاتێکدا پێچەوانەکەی ڕاستەو ئەو تا سەر ئێسقان ئەدیب و مرۆڤدۆست و ڕۆشنبیرە.!

## * زمان و گێڕانەوە لەیاداشتەکەدا

زمانی گێڕانەوە، گرنگترین ڕەگەزی هونەری یاداشت نووسینە، ئەو زمانە پەخشان ئامێزەی دکتۆر عیزەدین زمانێکی پاراو و پوخت و جوانە، بەڵام لە هونەری گێڕانەوەی زمانەکەدا پێویستی بەوە دەکرد زمان زیاتر ڕۆڵ ببینێت لە یاریکردن بەکات و شوێنی ڕوداوەکان، نەک بەو شێوەیەی دکتۆر وەک زنجیرەیەک رووداو لەکاتی لەدایک بوونییەوە تا ئەو شوێنەی خۆی دەیەوێت بە یەک زمان و بە یەک ڕیتم یاداشتەکان بنووسێت و هیچ جۆرە یارییەکی زمانەوانی و گێڕانەوەی نەبێت.

زمان و بەهای زمان لە هونەری یاداشت نووسیندا هیچی کەمتر نییە لەهونەری چیرۆک و شیعر و ڕەگەزەکانی تر، بەو پێیەی دکتۆر خۆشی ئەزموونی لەو بوارانەی تردا هەیە دەبوو زۆر تایبەتمەندی ببەخشیایە بەنووسینی یاداشتەکانی لەڕووی زمان و گێڕانەوە، بەڵام دەبینین ئەم بەرگەی یاداشتەکان کە ٣٠٠ لاپەڕەیە لە سەرەتاوە تا کۆتایی بەیەک زمان و بەیەک ڕیتم و یەک چیرۆکە و بۆ ساتێکیش ڕوداوەکـان و ڕیتمی ئەو شتانەی کە دەیگێڕێتەوە گۆڕانی بەسەردا نایەت، تەنانەت دەیتوانی بەش بەش جیایان بکاتەوە نەک هەموو رووداوەکان بە یەک زمان و لەژێر یەک چیرۆکدا بگێڕێتەوە، ڕەنگە ئەمەش بۆ زۆری ئەو ڕوداو و بابەتانە بگەڕێتەوە کە دکتۆر لە یاداشتەکانیدا باسی کردوون، من بۆخۆم لەزۆربەی ئەو نووسەر و مامۆستایانەی زانکۆ کە وانەیان پێوتووم هیچ نووسەرێکم نەبینیوە هێندەی دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ یادەوەری بەهێز بێت، بەهێزی یادەوەریی ئەو لە یاداشتەکانیدا ڕەنگیداوەتەوە، بەڵام پرسیاری گرنگ لێرەدا ئەوەیە تا چەند ئەو یادەوەریە بەهێز و ئاست بەرزە زمانەوانییەی دکتۆر لە یاداشتەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە؟ من پێشنیار دەکەم بۆ دکتۆر لەبەشی دووەم و سێیەم و بەشەکانی تردا ڕیتم و شێوازی زمان و گێڕانەوەی بگۆڕێت، بەتایبەتی بەپێی ئەم بەشەی یاداشتەکانی بێت لە بەشی دووەم و بەشەکانی تردا زۆر ڕوداوی گرنگتر ڕوودەدەن و ئەو دەیگێڕێتەوە.

من بۆخۆم لە بەشەکانی تردا چاوەڕێی ئەو پەیوەندییە بەهێزە لەم نووسەرە دەکەم کە لەگەڵ سەرکردەکانی کورد لە هەر چوار پارچەی کوردستان هەیەتی، دواتر پەیوەندی خـۆی بە نـووسـەران و ڕۆشنبیرانی کـورد، کەسایەتییە ئەکادیمیەکان...هتد.. ئەم ڕەگەزانە چۆن لە بابەتی یاداشت و بەشەکانیدا جێگە دەکاتەوە، بەتایبەتیش لە هونەری نامەنووسینی یاداشتیدا ئەوەی من ئاگاداربم دکتۆر عیزەدین خاوەنی گەنجینەیەکی گەورەی نامەیە کە لەلایەن کەسایەتی و سەرکردە کوردەکانەوە بۆی نێردراوە، هیوادارم لەبەشەکانی تری یاداشتەکانیدا ئەم ڕەگەز و تایبەتمەندییانە ببینین.



# هەست و سۆزی وەفاداری

## بۆ پرۆفیسۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ

**یاسین قادر بەرزنجی**



لەڕاستەوە: بیرمەندی عێراقی هادی العلوی، م. محەمەدی مەلا کەریم، د. عیزەدین (منداڵەکە: یاسین قادر بەرزنجی).

لە کۆتایی پەنجاکاندا خاڵە عیزەدینم لە دەربەدەریی وڵاتی شام گەڕاوەتەوە و لە سەرەتای شەستەکاندا بۆ خوێندن نێردراوە بۆ یەکێتی سۆڤیەت، کەسێکی ناسراو و تێکۆشەرێکی دیارو نووسەرو ڕۆژنامەنووسێکی خاوەن بەرهەم بووە، لەبیرمە ساڵی ١٩٦٣ کە بڕوانامەی دکتۆرای بەدەستهێنا، دایکم و تەواوی ماڵی باپیرم شادیی بووە میوانی ڕۆح و دەروونیان، بەڵام هەزار ئەفسووس باوکی بەڕێزیان چاوی بەو کوڕە جگەرگۆشە نۆبەرەیەی نەکەوتەوە و مەرگ کردیە میوانی سەیوان و بەوەش ساباتی ماڵەکە و تەواوی بنەماڵەی حاجی مەلا رەسووڵی دێلێژە هەرەسی هێنا.

وادەزانم ساڵی ١٩٦٤ بوو، هەر لەماڵی باپیرم کە ئێمە لە زمانی (کاک سەروەر)مەوە پێمان دووت (بابە باش) بەدیار رادیۆی بەجێماوی بابە باشەوە کۆدەبووینەوەو گوێمان لەدەنگ و وشە پڕ واتاکانی (دکتۆر عیزەدین) دەگرت، ئەو دەمەی لە رادیۆی دەنگی گەلی عێراق لە سۆفیای پایتەختی بولگاریاوە بەرنامەکانی پێشکەش دەکرد، نەنکم و دایکم دەگریان و منی تەمەن هەشت ساڵیش بەدیاریانەوە ئەوق دەمام و بەڕامانەوە گوێم بۆ شل دەکرد.

ئا لەوێوە خاڵم ناسی، بەڵام کە دواتر گەڕایەوە و کتێبی (رازی دووری)ی



**خوالێخۆشبوو مەلا مستەفای سەفوەت، سەروەر قادر بەرزنجی (تەمەن ٣ ساڵ و نیو)، یاسین قادر بەرزنجی (٦ مانگ)**



دامێ و چەندین جار لەبەرگەوە بۆ بەرگ خوێندمەوە، زانیم چیرۆکی کوردی چۆنە و ئەو ساڵە کە ١٩٦٨ بوو، بوومە ئاشنای نووسینی ئەو نووسەرە بەرز و بەنرخە و دوای کتێبەکانی تری، بۆ هەموو لایەک سەلما کە بەهەق یەکێکە لە مامۆستا و ئەدیبە گەورەکانی کورد.

کەواتە خوێنەری ئازیز، گەر سەرسامانە تریش بنووسم بەرامبەر ئەو رۆژگاری بیر شڵەقاندنە و بۆ گێڕانەوە روو لە سرووتی تریش بکەم بۆ باسی هەندێ یادگاری نێو ئەو ماڵە رووناکە و بەتایبەت سەبارەت بەخاڵی یەکەمم، کە ئەم رۆڤارەی بۆ تەرخانکراوە، هێشتا هەر کەمە و رەنگە توانای پێنووسی منیش هەر ئەوەندە بێ.

هەر لە سەرەتای حەفتاکاندا کاتێ هەڵەچنی کتێبی (لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی)ی چەند جار چاپکراوی ئەوم دەکرد، بۆ یەکەم جار لە بایەخی سامانی فۆلکلۆر و ئەدەبیای میللی گەیشتم و بابەتەکانی ئەو کتێبە دوای چەندین ساڵ بوونە ژێدەر و سەرچاوە بۆ چەندین کاری شانۆییم.

لەئامادەییدا کتێبی (الواقعیە فی الأدب الکردی)ی چاپی بەیروتم خوێندەوە کە بەبڕوای رەخنەگر و توێژەران یەکێکە لەکتێبە هەرە گرنگەکانی شەستەکان.

ئەوەی کە زیاتریش ئاشنای کردم بە توانا و بیری قووڵی ئەو ، شاکارەکەی (ئەحمەدی خانی) شاعیر و فەیلەسووف و بیرمەندی سۆفیی کورد بوو، کە نەوەیەک لەخوێنەری ئێمە بەهۆی ئەو کتێبەوە (خانی)مان ناسیوە.

من بەردەوام هۆگری نووسینەکانی بووم، بە تایبەت وتار و بابەتە رەخنەییەکانی لەسەر شیعری نوێی کوردی لە (برایەتی) و گۆڤاری (بەیان)ی سەرەتای حەفتاکاندا، کە بە پەرۆشەوە یەک بەیەکیانم دەپاراست.

هەر بە پەرۆشیشەوە گوێگری بەرنامە هەفتانەکانی بووم لەسەر ئەدەبیات و شیعری کوردی کە لە رادیۆی کوردی بەغداوە پەخش دەکران.

هەموو ئەو ساڵانە، هەزاران کەس سوودمەندبوون لە وتارو بابەت و کتێبەکانی ئەم نووسەرە گەورەیەی کورد، کە لەپاڵ نووسیندا مامۆستای هەر سێ قۆناغی خوێندنی (سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی) بووە و دواتریش لە زانکۆکانی بەغدا و سلێمانی و سەلاحەدین بووەتە یەکێک لەمامۆستا و پرۆفیسۆرە هەرە ناودارەکانی کورد و لە زۆر جێگا و بۆنەدا خوێندکارانی دوێنێ و ئەمڕۆی، هەر لە پەنجاکانەوە تا

دەگات بە ئێستا ئەمەکدارانە لەو مامۆستا بەڕێزەیان دەدوێن کە زۆری لێوە فێر بوون و هەرگیز لە یاد و یادەوەرییاندا کاڵ بوونەوەی بۆ نییە.

وەک وتم، منیش لە زووەوە سوودمەندبووم لەو مامۆستا زانایە و لە ئەزموونی هونەری و نووسین و ڕۆژنامەنووسیی خۆمدا، هەمیشە پرس وڕام بەخاڵم کردوە، تەنانەت زۆرجار کە نووسینی خۆیشم نیشانداوە، بەر لە بڵاوکردنەوە، یان لە دوای بڵاوکردنەوە، بەوپەڕی لەخۆ بردووییەوە کاتی بەنرخی پێ بەخشیوم و لە ئامۆژگارییەکانی بێ بەشی نەکردووم.

ئەمە بێجگە لەوەی هەمیشە لەدەیان ساڵی ماوەی زێڕینی کارکردن و سەرۆکایەتیی یەکێتی نووسەرانی کوردیدا، ئامادەی چەندین کۆڕی بووم لە سلێمانی وهەولێر و بەغدا و ئەوانەش بۆ ئێمەی لاو سەرچاوەی فێربوون بوون.

یەک لەیادگارە شیرینەکانی تریشم، یاوەری خاڵم بووە بۆ چاپخانەکانی بەغدا بۆ سەرپەرشتیی چاپکردنی کتێبەکانی، یان لە چاپدانی گۆڤاری بەنرخی (نوووسەری کورد) کە هەر خۆیشی سەرنووسەری بوو، بەڵێ چەندین جار ئەو شەرەفەم پێ بڕاوە لەگەڵ ئەو و ئەدیبی گەورەی گەلەکەمان (مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم) چووینەتە چاپخانەی (الحوادث) ی بەغداد و بۆ چاودێریی لەچاپدانی گۆڤارەکە، یان بۆ وەرگرتنەوەی و بردنەوەی بۆ بارەگای نووسەران لە وەزیریە، کە هەر بە ئۆتۆمبیلەکەی دکتۆر دەمانبردنەوە.

نابێ ئەوەش لەیاد بکەم، لە ژیانی هونەریی خۆمدا، دوو بیرەوەریی کارکردنم هەیە لەگەڵ دوو چیرۆکی ئەودا، کە بەهیوام لەم ژمارەیەی (ڕۆڤــار)دا وەک نموونەی گەش لەچیرۆکی ئەو و ئەدەبیاتی ئەو قۆناغە، بخرێنەوە بەرچاوی خوێنەرانی ئەمڕۆمان، چونکە بـەبـڕوای من لە نموونە جوانەکانی چیرۆکی کوردین، ئەوانیش، یەکەم (ئێمەش منداڵا بووین) کە کاتی خۆی کردمان بە درامایەکی رادیۆیی و پەخش کرا، دووەمیش (وا گوڵ ئەسووتێ) کە لەکۆتایی حەفتاکاندا لەلایەن هونەرمەندی نەمر (کەمال سابیر) لە تیپی پێشڕەو کرایە پڕۆژەی فیلمێک و بڕیار وابوو ژمارەیەک لەو ئەکتەرانەی تیپەکە بەشداربین تیایدا، بەداخەوە ئەو خەونە نەهاتە دی، دوای ڕاپەڕین هەر لای کاک کەمال بووەوە بەپڕۆژە و داخەکەم ئەمجارەیان مەرگ ڕێگای نەدا.

لەکۆتاییدا، درووود بۆ خامەی هەمیشە لەکاردای نووسەر و ئەدیبی گـەورەی نەتەوەکەمان (د. عیزەدین مستەفا ڕەســووڵا)و بەخششە گەورەکەی لە دنیای ڕووناکبیریی کوردیدا.. تامردن ئەمەکدارم بەرامبەر یەک بەیەکی وانەکانی ئەم خاڵە بەڕێزەم کە هەموو هیوایەکم تەندورستیی باش و ژیانی پڕ لە سەرفرازییەتی.



یاسین قادر بەرنجی                د. عیزەدین                د. نەورۆز شەوکەت

# د. عیزەدین
# دونیایەك لەباوكایەتی!

باوک، بۆ هەموو کەس گەورەترین و خۆشەویسترین و پیرۆزترینە، جا ئەگەر ئەو باوکە یەکێک بێت بۆ کەسانی تر زۆر لەو بەهایانەی هەبێت، دەبێت لای کچی خۆی چۆن بێت!

د. عیزەدین، سەرەڕای میهرەبانی و بەخشندەیی بێپایانی بۆمان لە هەموو کاتدا، لەگەڵ باوکێتیدا نزیکترین هاوڕێمان بووە، چەسپێنەری کوردایەتی و مرۆڤایەتیمان بووە هەر لەمناڵیەوە؛ پشت و پەناو دڵ و سۆزی هەمیشەییمانە. بۆ چرکەیەک بیرم نایەت دڵی شکاندبین، بۆ ساتێک بیرم نایەت ڕوویەکی توورە و گرژی پیشان دابین.

کە کچی د. عیزەدین بیت، زۆر شتت بۆ هەڵدەکەوێت بۆ کەسێکی تر لەوانەیە ئەستەم بێت، هەندێ جاریش خەو بێت.

کە کچی ئەو بیت، دنیای خوێندەواری و کتێب و ئەدەب و سیاسەت لەبەردەمتدا والآیە، دەرگای ڕۆشنبیری و هونەر و بیر بە ئاسانی کراوەیە.

ناسینی سەدان ئەدیب و شاعیر و سیاسی و ناوی ئەفسانەیی کورد و عەرەب و بیانی شتێکی ئاساییە.

د. عیزەدین دەریایەکی لەبن نەهاتوو لە ئەدەب و زانیاری ناوازە بۆ کورد، بۆ من دنیایەکە لە باوکایەتی!

سوپاس بۆ یەزدان کە ئەو باوکمە
سوپاس بۆ ئەویش کە هەموو شتێکە!



**د. یار عیزەدین مستەفا**





# بۆ باوکی ئازیزم:

خۆزگە لە حاڵ و باری دڵێک دەزانی کە ململانێی شەپۆلەکان دەکا، تا خۆشەویستی تۆی بلیمەتی پێ ناوە ناو بە هەشتی بیر و بۆچوونەکانت بەدەست بێنێ و تۆڵەی ساڵانی ئەشکەنجەیەک بکاتەوە، هەر تامی هیوای سبەینێی ڕووناکییەکانتی کردووە. خۆزگە لە حاڵ و باری منداڵێکی ناو ناخی ئێمەت دەزانی، مۆمەکانی لەدایکبوونی خۆی بە تەمەنی ئەو ساڵانە کە بەردەوام داواکاری ڕەزامەندیی تۆن، دەکوژێنێتەوە، دەبێتە لاو و پیر دەبێ تا نەوەیەک لە ناخماندا لەدایک ببێ، دەژی و دەمرێ لە دێڕەکانی مێژوویەکدا تەنیا تۆ و گیانی فریشتەی تێدا نەمرن.



خۆزگە لە حاڵ و باری قەڵەمێکت دەزانی، بەدوای باڵاترین وشەدا دەگەڕێ تا وەک ناونیشانی کتێبێک تێتدا بدرەوشێتەوە.

خۆزگە لە حاڵ و باری هەتیوێکت دەزانی، لە بنەماکانی ژیاندا بەشوێن خاوەنێکدا دەگەڕێ وەک باوک بەزەیی و سۆزی بەدەست هێناوە.

خۆزگە لە حاڵ و باری ئافرەتێکت دەزانی بەڕاست و چەپدا دێ و دەچێ تا دڵی پیاوت تێدا بەیدەست بکا، قوتابیەکیش بەربەرەکانیی خۆی دەکاو تێ دەکۆشێ تا زەردەخەنەی مامۆستات تێدا بەدەست بێنێ.

خۆزگە لە حاڵ و باری ئەو خوێنەرە سەرگەردانانەت دەزانی کە بەدوای خوێنی گەرمی تۆدا دەگەڕێ

و ئەو مێیەیش کە ململانێی دابونەریت و یاسای کۆمەڵێکی پیاو سالار دەکا، ململانێ دەکاو دەکا.
تۆیش نازانی ئەو بەربەرەکانیی جیهان دەکا تا جێی باوک بۆ ناوی تۆ و مێژوو بگرێتەوە، خۆزگە بەو ئازارانەت دەزانی کە لە غەریبایەتی دیمانن و پێیانەوە دەمانناڵاند و ئەو باس و خواس و شەوانەمان بیر دەکەوتەوە کە ئەگەر تۆی شۆڕشگێڕ و سیاسەت و حیکایەتخوێن و چیرۆک و عاشق و بەسەرهات نەبوایە، نەدەبوون. ئەگەر تۆی تێدا هێرشبەر و قوربانی نەبوویتایە، ئەگەر تۆی تێدا سیاسەت و ئەدەب و بیری فراوان نەبوویتایە، ئەم شەوانەیش نەدەبوون.
خۆزگە بە حاڵی ئەو چاوانەت دەزانی کە ساتەکانی گەڕان بەشوێن بەختەوەریی دانیشتن لە تەکتەوە و گوێ هەڵخستن بۆ قسەکانت خەوی تێدا دەزڕاندین.
بابە، نیگەرانیی مێژوو و نموونەی هاوشێوە هێنانەوە لە تۆمان دوور ناخاتەوە. تۆ یاسات تێدا دانان و ناچارت کردین وەک قەڵەم و منداڵ و چاو و ئازار و قوتابی و نیشتمانپەروەر و داکۆکیکەر لە ماف و بنەماکانی ژیان بێینە بەردەمت، لە ڕۆژگارێکدا تۆ تۆوت تێدا چاند و ئێمە بەری دەچنینەوە، بەڵکوو ئێمەیش وەکو تۆ دڵسۆزی بین، بەڵکو وەک تۆ فێرت کردین، بزانین، بەڵکو وەک تۆ خۆشت ویستووە، ئێمەیش خۆشمان بوێ و گەمەی لە تەکدا بکەین و وەک دڵت داینەوە، دڵی بدەینەوە و وەک تۆ وشە و بیر و بۆچوونت خوڵقاند و ئەشکەنجەت لە پێناوی ئەو خاکەدا کە هەڵی گرتین و ئەو دایکە کە بەخێوی کردین، واتە کوردستان، چێشت ئێمەیش وشە و بیر بخوڵقێنین.
بۆیە لێمان ببوورە ئەگەر نەگەیشتبینە باڵای قەڵەم و بیرت، لێمان ببوورە ئەگەر وەک تۆ درێژەت بە پێوەندی بە خوێندەوارانتەوە داوە، ئێمە کەمتەرخەم بووبین، لێشمان ببوورە ئەگەر فێرنەبووبین چۆن خۆشەویستیمان بۆ خۆشەویستەکەت، کوردستان، داوای لێ بکە لێمان خۆش بێ، لە هەنگامە و شێتگیریمان خۆشبە، چونکە سەردەمەکە و دەریایش شێتن.
دەریاکان چارەنووسمانن و خۆشەویستی چارەنووسمانە، تۆیش ببە بە یاریدەدەر و قەڵەممان.
لە لاوی و بەربەرەکانیی لێبڕاوانەمان خۆش بە، چونکە ئێمە دواجار کەڵک لە تۆ دەبینین بۆ نیشتمانەکەمان و ڕۆژگاری وەفاداری و ئەوین و بەرزی، ڕۆژگاری کارکردن سەرباری هەڕەشەی گوللە، ڕۆژگاری گەڕان بەشوێن ئاشتیدا سەرەڕای هەڕەشە و گوڕەشەی ئەشکەنجەدان لە بەندیخانەکاندا لە قسەکانی تۆوە بەدی دەهێنینەوە.
لەبێ سەروبەرەییمان خۆش بە، چونکە ئێمە لە ڕۆژگارێکداین ڕاستگۆیی تێدا کەم بووە، لە کتێبێکی بەردەستدا تەماشای دەکەین.
لە بەرەنگاریی بێوەی و توندوتیژمان خۆش بە، لە ڕۆژگارێکدا دەستپاک کەوتووەتە نێوان کۆمەڵە پووش و پەڵاشی بۆگەن، خۆمانی لێ ڕزگار دەکەین.
لێمان خۆش بە کە دوورین لە ڕۆمانسێتی و ئەدەب، چونکە ڕۆژگارەکەمان ڕۆژگاری جیهانگیری و گەیشتن بە شەمەندەفەری زانست و تەکنەلۆجیایە، ڕۆژگاری فەلسەفەی خێرا و نووسینی زۆر و زەبەند، هێشتا تێیدا بەدوای کاری مرۆدۆستانەدا دەگەڕێین، تا لە قسە و قسەڵۆک خۆ بپارێزین.
هاوکاری ڕۆژگار و ئامرازەکانی بەرگریمانبە، چونکە ئێمە لەکاتێکدا خەریکین ڕێزت لێ بنێین و ڕێز لەو تۆوە بنێین کە لەناخی ئێمەدا چاندت تا بە قوربانی خۆشەویستەکەت و پاشماوەی مرۆڤایەتی بین.
پێبکەنە، چونکە قوربانییەکانت بەفیڕۆ نەچوون و نووسینەکانت بەخۆڕایی نەڕۆیشتن، پێبکەنە، چونکە مرۆڤایەتی پلەوپایەیەکی دەبێ، تا ئەوی لە پێناویدا تێکۆشاوە، بمێنێتەوە و هەموو ڕۆژێک ڕێزی لێ بنرێ.

**کچت**

**ڕاز عیزەدین مستەفا**



# ئەلبوومی وێنەکان



لەڕاستەوە:
د. مۆفەق دەرگەڵەیی- د. کەمال عەلی- مام جەلال- شاکرۆ- د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ (سلێمانی ساڵی ٢٠٠٠)



مەسعوود بارزانی - د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ



عەبدوڵڵا ئۆج ئالان - د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ



عەبدوڵڵای حەسەن زادە - حەسەنی شەرەفی - د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ - د. صادقی شەرەفکەندی- ڕووناك خانی خێزانی د. عیزەدین



د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ - ڕەفیق مەحموود (ڕەفیقی وێنەگر)



لەچەپەوە: سادق بەهادین- د. عیزەدین- ن- کامەران موکری و چەند هاوڕێیەکی - ١٩٧٢ باکۆ



د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ لەگەڵ مامۆستایانی مەکتەبی فەیسەڵیە ١٩٥٦



د. عیزەدین ١٩٦٦ ناوپردان



هێمن - د. عیزەدین



د. هیدایەت عەبدوڵلا حەیران- عوسمان بایدەمیر- د. عیزەدین



د. عیزەدین- عەبدولڕەحمان زەبیحی- جەمال نەبەز



د. عیزەدین لەگەڵ خالید بەکداش



د. عیزەدین لەگەڵ جەواهیریدا



د. عیزەدین- جەلال دەباغ



د. عیزەدین لەسەر گۆڕی یەڵماز گوینای

